# ئیسلام

## پەیامێکی پوخت سەبارەت بە ئاینی ئیسلام بەو شێوەیەی لە قورئان وسونەتدا هاتووە

(چاپێک کە هەموو بەڵگەکانی قورئان وسونەت لە خۆ دەگرێت) [١]

---

[١] چاپێکی تر هەیە سەبارەت بەم پەیامە تەنها بابەتەکانی تێدا باسکراوە و بەڵگەکانی قورئان وسونەتی تێدا باس نەکراوە، بۆ خوێندنەوەی کلیك لەسەر ئەم بەستەرە بکە:
https://islamhouse.com/ku/books/٢٨٣٢١٤٦

# بسم الله الرحمـــن الرحيم

کتێبێکــی گــرنگە پێناســەیەکی پــوختی ئــاینی ئیســلامی لە خــۆ گرتــووە وڕوونکردنەوەی گرنگترین بنچینە ورێنمایی وجوانییەکانی ئاینی ئیسلامی تێدایە لە قورئان وسـونەتدا، وئەم کتێـبە بـۆ مسـوڵمانان وبـۆ نامسـوڵمانانیش دەگونجێـت بە زمانەکانیان لە هەموو کات وشوێنێک سەرەڕای جیاوازی حاڵ وبارودۆخ.

## ١. ئیسلام پەیامی خودایە بۆ هەموو خەڵکی، کۆتا پەیـامی خـودایە بۆ مرۆڤایەتی هەتا قیامەت بەرپا دەبێت.

ئیسلام پەیامی خودایە بۆ هەموو خەڵکی، خوای گەورە دەفەرموێت: { وَمَا أَرۡسَـلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَـذِيرٗا وَلَٰكِـنَّ أَكۡـثَرَ ٱلنَّـاسِ لَا يَعۡلَمُـونَ} واتە: {وئـێمە تۆمـان نەناردووە بۆ هەموو ئادەمی بە مژدەدەر وترسێنەر نەبێت بەڵام زۆربەی ئـادەمی هەق ناناسن ونایزانن} [سبأ:٢٨]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {قُلْ يَا أَيُّهَا النَّـاسُ إِنِّي رَسُـولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا} واتە: {(ئەی موحەممەد -صلى الله عليه وسلم-) پێیان بڵـێ: ئەی خەڵکینە بەڕاستی من پێغەمبەری خودام بۆ ئێوە هەمووتان (بـۆ هەمـوو خەڵکـی بە بێ جیاوازی ڕەگەز ورەنگیان)}[الأعراف:١٥٨]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {يَـا أَيُّهَـا النَّاسُ قَدْ جَاءَكُمُ الرَّسُولُ بِالْحَقِّ مِن رَّبِّكُمْ فَآمِنُوا خَيْرًا لَّكُمْ وَإِن تَكْفُرُوا فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا} واتە: {ئەی خەڵکینە بێگومان پێغەمبەر هێناویەتی بۆتان ڕاستی ورەوا لە لایەن پەروەردگارتانەوە کەواتە ئێوەش بـاوەڕ بهێـنن چاکترە بۆتان وئەگەر باوەڕ نەهێنن ئەوا بێگومـان هەرچـی لە ئاسـمانەکان وزەویـدا هەیە موڵکی خودایە وخودا هەمیشە زانا ودانا و(کاردروستە)}[النساء:١٧٠]. ئیسلام پەیامی خودایە بۆ هەتاهەتایە، وکۆتا پەیامی پەروەردگارە، خوای گەورە دەفەرموێـت:

{مَّا كَان مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا} واته: {موحەممەد -صلى الله عليه وسلم- باوکی هیچ یەکێک لە پیاوەکانتان نییە (نەزەیدی کوڕی حاریس ونە هیچ کەسێکی تر) بەڵکو ئەو نێردراوی خودا وکۆتاهەمینی پێغەمبەرانە وخودا بەهەموو شتێك زانایە}[الأحزاب:٤٠].

## ٢. ئیسلام ئاینێکی تایبەت نییە بە ڕەگەزێکی دیاریکراو یان گەلێکی دیاریکراو بەڵکو ئاینی خودایە بۆ هەموو خەڵکی.

وئیسلام ئاینێکی تایبەت نییە بە ڕەگەزێک یان گەلێک بەڵکو ئاینی خودایە بۆ هەموو خەڵکی ویەکەم فەرمان کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، خوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ} واتە: {ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان بپەرستن کەئێوەو ئەوانەی پێش ئێوەشی دروست کردووە بەڵکو بەو پەرستنە خۆتان بپارێزن}[البقرة: ٢١]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً } واتە: {ئەی خەڵکینە خۆتان بپارێزن لە (سزای) پەروەردگارتان (لە خودا بترسن وتەقوادار بن) ئەوەی کە دروستی کردوون لە یەک کەسەوە (کە ئادەمە) وهەر لە ئەویش هاوسەرەکەی درووست کردووە وبڵاوی کردووەتەوە لەو دووانە پیاوانی زۆر هەروەها ئافرەتان} [النساء:١]. لە ئیبن عومەرەوە -ڕەزای خوایان لێبێت- کە پێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- ڕۆژی فەتح وڕزگارکردنی مەککە وتاری بۆ خەڵکی دا، وفەرمووی: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِّيَّةَ الجَاهِلِيَّةِ وَتَعَاظُمَهَا بِآبَائِهَا فَالنَّاسُ رَجُلَانِ: بَرٌّ تَقِيٌّ كَرِيمٌ عَلَى اللَّهِ وَفَاجِرٌ شَقِيٌّ هَيِّنٌ عَلَى اللَّهِ وَالنَّاسُ بَنُو آدَمَ وَخَلَقَ اللَّهُ آدَمَ مِنْ تُرَابٍ قَالَ اللهُ: {يَا

أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ} [الحجرات:١٣]» واته: «ئەی خەڵکینە خودا نەزانینەکانی (نەفامیەکانی) جاهیلیەت وشانازی کردن بە باوباپیرانەوە لەسەر لابردن (بەهۆی مسوڵمان بوونتانەوە)، خەڵکی دوو چینن: چاکەکارێکی تەقوادار کە ڕێزدارە لای خوای گەورە، وتاوانکارێکی دۆڕاو کە بێڕێزە لای خوای گەورە، وخەڵکی نەوەی ئادەمن وخوای گەورە ئادەمی لە خۆڵ دروستکرد، خوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ} [الحجرات:١٣] واتە: {ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە دروستمان کردوون لە نێر ومێیەك وکردومانن بە چەند گەل وهۆزێکەوە تا یەکتری بناسن، بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خودا ئەو کەسەیە کە زیاتر لە خودا دەترسێت، بێگومان خودا زانا وئاگادارە}»[رواه الترمذي: ٣٢٧٠]. لە فەرمانەکانی قورئان وسونەتدا هیچ فەرمان وشەریعەت ویاسایەکی تایبەت نابینیت کە تایبەت بێت بە گەلێک یان هۆزێکی دیاریکراو بەهۆی ئەوەی لە ڕەگەزێک یان گەلێک یان هۆزێکی دیاریکراون.

## ٣. ئیسلام پەیامی خودایە کە تەواوکاری پەیامی پێغەمبەرانی پێشووە -عليهم الصلاة والسلام- بۆ ئومەتەکانیان.

ئیسلام پەیامی خودایە کە تەواوکاری پەیامی پێغەمبەرانی پێشووە -عليهم الصلاة والسلام- بۆ ئومەتەکانیان، خوای گەورە دەفەرموێت: {إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَىٰ نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِن بَعْدِهِ وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا} واتە: {بەڕاستی ئێمە وەحیمان (سروشمان) بۆ ناردیت هەروەکو چۆن وەحیمان نارد بۆ نوح وبۆ

پێغەمبەرەکانی پاش ئەو و وەحیمان نارد بۆ ئیبراهیم وئیسماعیل وئیسحاق ویەعقوب ونەوەکانی یەعقوب وبۆ عیسا وئەیوب ویونس وهارون وسولەیمان وزەبوریشمان بەخشی بە داود}[النساء:١٦٣]. ئەم ئاینە کە خودا وەکو وەحی (سروش) بۆ پێغەمبەر موحەمەد -صلى الله عليه وسلم- ناردوویەتی؛ هەمان ئاینە کە خودا بۆ پێغەمبەرانی پێشوو ناردوویەتی، وخودا وەسیەت وئامۆژگاری کردووە بەوەی کە دەستی پێوە بگرن وفەرمانەکانی جێبەجێ بکەن وخۆیان لە نەهی لێکراوەکان بپارێزن، خوای گەورە دەفەرموێت: {شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ اللَّهُ يَجْتَبِي إِلَيْهِ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ} واتە: {ئەو ئاینەی بۆ داناون کە فەرمانی داوە بە نوح وئەوەش نیگامان کردووە بۆ تۆ وئەوەش کە فەرمانمان داوە بە ئیبراهیم وموسا وعیسا کە لەسەر ئەو ئاینە بن بە رێك وڕاستی وجیاوازی تێدا مەکەن زۆر قورس وگرانە بەلای هاوبەشدانەرانەوە ئەوەی ئەوانی بۆ بانگ دەکەیت خودا هەرکەسێکی بوێت هەڵیدەبژێرێت بۆ (موسڵمان بوون) لای خۆی وڕێنمونی وهیدایەتی هەرکەسێك دەکات بۆ لای خودا بگەڕێتەوە}[الشورى:١٣]. ئەم کتێبە کە خودا وەکو وەحی (سروش) بۆ پێغەمبەر موحەمەد -صلى الله عليه وسلم- ناردی؛ بەڕاستدانانی کتێبەکانی خودایە لە پێشوودا وەکو تەورات وئینجیل پێش ئەوەی دەستکاری بکرێن وبگۆڕدرێن، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ هُوَ الْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ إِنَّ اللَّهَ بِعِبَادِهِ لَخَبِيرٌ بَصِيرٌ} واتە: {وئەوەی لە قورئاندا نیگامان کردووە بۆ تۆ هەر ئەوە ڕاستە وپشتیوانی کتێبەکانی پێش خۆیەتی بێگومان خودا بە بەندەکانی ئاگادار وبینایە} [فاطر: ٣١].

## ٤. پێغەمـــبەران -علـــيهم الســـلام- يەک ئاينيـــان هەيە، بەڵام شەريعەتەكانيان جياوازە.

پێغەمــبەران -علــيهم الســلام- يەک ئاينيــان هەيە بەڵام شــەريعەتەكانيان جياوازە، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا وَلَوْ شَاءَ اللّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ } واتە: {وئەم قورئانەمان ناردە خوارەوە بۆ تۆ بە هەق وڕاستی وكتێبەكـانی پـێش خـۆی بە ڕاسـت دەزانێـت وپشـتيوانيان لێـدەكات (پـێش دەسـت تێخسـتن وگۆڕينيان لەلايەن جولەكە وگاورەكـانەوە) وچاودێريـانە كەواتە حـوكم وبڕيـار بـدە لەناو نامەدارەكاندا بەوەی خودا ناردوويەتيە خوارەوە, وشوێن هەوا وئـارەزووی ئەوان مەكەوە لانەدەيت لەو حوكم و بڕيارە هەق وڕاستەی كە بۆت هـاتووە دامـان نـاوە بـۆ هەر ئوممەتێک لە ئێوە شەريعەت وڕێگەيەكی ڕوون وئەگەر خودا بيويستايە ئێوەی ئەكرد بەيەک ئوممەت وكۆمەڵ بەڵام (نەيكردوون) بـۆ ئەوەی تاقيتـان بكـاتەوە لەو شەريعەت وياسايانەی كە پێی بەخشيوون كەواتە پێشبڕكێ بكەن بۆ ئەو شتانەی كە چاكن گەڕانەوەتان هەر بۆ لای خودايە بە گشتی ئەمجا هەواڵتـان پێـدەدا سـەبارەت بەوەی كە لە ژيانی دونيادا تێيدا جياواز وناكۆک بوون} [المائدة:٤٨].

وپێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «أَنَا أَوْلَى النَّاسِ بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَالْأَنْبِيَاءُ إِخْوَةٌ لِعَلَّاتٍ أُمَّهَاتُهُمْ شَتَّى وَدِينُهُمْ وَاحِدٌ» واتە: «مـن نزيكترين كەسم لە عيسـای كـوڕی مەريەم لە نێـوان هەمـوو مرۆڤەكانـدا لە دونيـا ودوارِۆژدا، وپێغەمـبەران بـران لە بيروبـاوەڕدا (يەک عەقيـدە وبيروباوەڕيـان هەيە)

بەڵام دایکــی جیاوازیــان هەیە (شــەریعەتەکانیان جیــاوازە) و لەگەڵ ئەمەشــدا هەموویان هەمان ئاینیان هەیە» [رواه البخاري: ٣٤٤٣].

**٥. ئاینی ئیسلام بانگەشە دەکات هەروەکو بانگەشەی پێغەمبەرانــی پێشوو: نوح وئیبراهیم وموسا وسولەیمان وداود وعیسا -علیـه السـلام- بە ئــیمان وباوەڕهێنــان بــــەوەی کـــە پــــەروەردگار (الله) یە وئەو زاتە خوڵقــێنــەرە -الخـالق-ە وڕۆزیـــدەرەوە -الـرزاق-ە وژیـان دەبەخشـێت -المحيي-ە وزیندووەکان دەمرێنێت -المميت-ە وهەموو شتێک مـوڵکی ئەوە -مالك الملك- وهەموو کاروبـاری بوونەوەرەکـان ئەو بەڕێـوەی دەبـات وئەو زاتە مەزنە بە ڕەئفەتە -الرؤف-ە ومیهرەبانە -الرحيم-ە.**

خوای گەورە دەفەرموێت: { يَا أَيُّهَا النَّاسُ اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَـيْكُمْ هَـلْ مِـنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُـوَ فَـأَنَّىٰ تُؤْفَكُـونَ } واتە: {ئەی خەڵكیــنە بیــربكەنەوە لە فەزڵــی خــودا بە ســەرتانەوە ئایــا بــێجگە لە خــودا دروستکارێکی -خوڵقێنەرێکی- تر هەیە کە ڕۆزیتان بدات لە ئاسمان وزەویدا هـیچ پەرســتراوێکی ڕاســت وهەق نیـیە بـێجگە لە خـودا دەی چـۆن وا ڕووو وەردەگێـڕن (لەیەک خودا پەرستی)} [فاطر:٣]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُمْ مِـنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّنْ يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَنْ يُخْـرِجُ الْحَـيَّ مِـنَ الْمَيِّـتِ وَيُخْـرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَـيِّ وَمَـنْ يُـدَبِّرُ الْأَمْـرَ فَسَـيَقُولُونَ اللَّهُ فَقُـلْ أَفَـلَا تَتَّقُـونَ} واتە: {(ئەی موحەممەد -صلى الله عليه وسلم-) بڵێ: ئایا کێ ڕزق وڕۆزیتـان دەدات لە ئاسـمان (بە باران) ولە زەویەوە (بە ڕووەک) یان کێ خاوەنی (دروسـتکەری) گـوێ وچـاوانە وکێ زیندوو لە مردوو دەردەهێنێت ومـردوو لەزینـدوو دەردەهێنێت هەروەهـا کـێ

کارەکان هەڵدەسوڕێنێت بێگومان یەکسەر دەڵێن خودا کەواتە (ئەی موحەممەد -صلى الله عليه وسلم-) پێیان بڵێ: دەی بۆ خۆتان ناپارێزن (لە سزای خودا؟)} [يونس:٣١]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {أَمَّن يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ} واتە: {ئایا زاتێك کە لە سەرەتاوە بوونەوەر بەدیدەهێنێت پاشان (دوای مردنی) جارێکی تر دروستی دەکاتەوە وزاتێك کە لە ئاسمان وزەویەوە ڕزق وڕۆزیتان دەدات ئایا هیچ پەرستراوێکی تر هەیە لەگەڵ خوادا (نەخێر نییە) (ئەی موحەممەد -صلى الله عليه وسلم-) بڵێ بەڵگەتان بهێنن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن} [النمل:٦٤].

وهەموو پێغەمبەران -علیهم السلام- نێردراون بۆ بانگەوازی کردن بۆ پەرستنی خودا بە تەنها بە بێ بڕیاردانی هیچ شەریک وهاوبەشێک لە پەرستنیدا، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ فَمِنۡهُم مَّنۡ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنۡهُم مَّنۡ حَقَّتۡ عَلَيۡهِ ٱلضَّلَٰلَةُۚ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ} واتە: {سوێند بە خودا لەناو هەموو گەل وئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە (کە فەرمان دەکەن بە خەڵکی) بەوەی تەنها خودا بپەرستن ودووربکەونەوە لە (پەرستنی) هەرپەرستراوێکی تر ئینجا خودا هەندێکی لەو (ئوممەتانە) ڕێنمونی کرد وهەندێکیشیان (لەبەر خراپییان) گومڕایی یەخەی گرتن دەی بە زەویدا بگەڕێن وتەماشا بکەن سەرەنجامی بێباوەڕان چۆن بوو} [النحل: ٣٦]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ } واتە: {وئێمە نەمان ناردووە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێک مەگەر وەحیمان (نیگامان) بۆ ناردووە (بەوەی کە) بێگومان جگە لە من هیچ پەرستراوێکی هەق وڕاست نییە کەواتە تەنها من بپەرستن} [الأنبياء:٢٥]. خوای گەورە سەبارەت بە نوح -علیه السلام- لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: کە نوح

-عليه السلام- فەرموویەتی: {يَا قَوْمِ اعْبُـدُوا اللَّهَ مَـا لَكُـم مِّـنْ إِلَٰـهٍ غَـيْرُهُ إِنِّي أَخَـافُ عَلَيْكُمْ عَـذَابَ يَـوْمٍ عَظِـيمٍ} واتە: {ئەی گەلەكەم تەنهـا خـودا بپەرسـتن ئێـوە هـیچ پەرستراوێكتان نییە جگە لە خودا؛ بەڕاسـتی مـن دەترسـم (دووچـاری) ئێـوە بێـت سزای ڕۆژێكی گەورە (كە ڕۆژی دواییە)} [الأعراف:٥٩]. وخوای گەورە سەبارەت بە ئیبراهیم -علیه السلام- لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: كە ئیبراهیم -علیـه السـلام- فەرموویەتی: {وَإِبۡرَٰهِيمَ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِ ٱعۡبُـدُواْ ٱللَّهَ وَٱتَّقُـوهُ ذَٰلِكُـمۡ خَـيۡرٞ لَّكُـمۡ إِن كُنـتُمۡ تَعۡلَمُونَ} واتە: {و(ئەی موحەممەد -صـلى الـله علـيه وسـلم- باسـی ئیبراهـیم بـكە) كاتێك بە گەلەكەی ووت خودا بپەرستن ولێی بترسن ئەوە چاكترە بۆ ئێوە ئەگەر ئێوە بزانن} [العنكبوت: ١٦]. وخوای گەورە سەبارەت بە ساڵح -علیه السلام- لە قورئـانی پیرۆزدا دەفەرموێت: كە ساڵح -علیه السلام- فەرموویەتی: {قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ قَدْ جَاءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ هَٰذِهِ نَاقَةُ اللَّهِ لَكُمْ آيَةً ۖ فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِي أَرْضِ اللَّهِ ۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ} واتە: {ئەی گەلەكەم خودا بەتەنها بپەرسـتن جـگە لە ئەو هـیچ پەرسـتراوێكی ترتـان نیـیە بێگومـان مـوعجیزەیەكی ڕوونتان لە پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە ئەمە وشتری خـودایە (وەكـو ڕێزلێنانێـک بـۆ ئەم وشترە ئەم ناوەی پێدراوە -ناقة الله-) كە موعجیزەیەكە بۆ ئێوە جا لێی بگەڕێن با بخـوات وبلەوەڕێـت لە زەوی خـوادا وئـازاری مەدەن ودەسـتی بـۆ مەبەن بە خـراپە (ئەگەر وابكەن) تووشی سزایەكی سەخت وبە ئازار دەبن} [الأعراف: ٧٣]. وخـوای گەورە سەبارەت بە شـوعەیب -علیـه السـلام- لە قورئـانی پیـرۆزدا دەفەرموێـت: كە شوعەیب -علیه السلام- فەرموویەتی: {يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰـهٍ غَـيْرُهُ ۖ قَـدْ جَاءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُـمْ ۖ فَـأَوْفُوا الْكَيْـلَ وَالْمِيـزَانَ وَلَا تَبْخَسُـوا النَّـاسَ أَشْـيَاءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْـدَ إِصْـلَاحِهَا ۚ ذَٰلِكُـمْ خَـيْرٌ لَّكُـمْ إِن كُنـتُم مُّـؤْمِنِينَ} واتە: {ئەی گەلەكەم بەتەنها خودا بپەرستن هیچ پەرستراوێكتان نییە بـێجگە لە ئەو؛ بێگومـان

له لایەن پەروەردگارتـانەوە بەڵـگە ومـوعجیزەیەکی ڕوون وئاشـکراتان بـۆ هـاتووە کەواتە لە پێـوانە وکێشـانەتان دا ڕێـک وڕاسـت بـن ولە شـتومەکی خەڵکـی کەم مەکەنەوە (بە دزی) ولە زەویـدا خراپەکـاری مەنێـنەوە (مەکەن) لە پـاش چـاکردنی ئەوەی باسکرا چاکترە بۆتان ئەگەر ئێوە ئیماندارن} [الأعراف: ٨٥].

ویەکەمجار کە خودا قسەی لەگەڵ موسا کرد -علیە السلام-، خودا -سـبحانە وتعالى- پێی فەرموو: { وَأَنَا اخْتَرْتُكَ فَاسْتَمِعْ لِمَا يُوحَىٰ (١٣) من تۆم هەڵبـژاردووە (بـۆ پێغەمبەرایەتی) کەواتە گوێ بگـرە بـۆ ئەوەی نیگـا بـۆت دەکرێـت (وەحـیەی بـۆت دەنێردرێـت) (١٣) إِنَّنِـي أَنَـا اللَّهُ لَا إِلَٰـهَ إِلَّا أَنَـا فَاعْبُـدْنِي وَأَقِـمِ الصَّـلَاةَ لِـذِكْرِي (١٤) بەڕاستی هەر من خوام هیچ پەرستراوێکی هەق وڕاست نییە جگە لە من کەواتە من بپەرستە بە چاکی نوێژ ئەنجامبدە بۆ ئەوەی یادی من بکەیتەوە (١٤)} [طـه: ١٣-١٤]. وخوای گەورە سەبارەت بە موسا -علیە السلام- لە قورئانی پیـرۆزدا دەفەرموێـت: کە موسا -علیە السلام- پەنای بە خودا گرت وفەرمووی: {إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُـلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ الْحِسَابِ (٢٧) وموسا -علیە السلام- ووتی: بەڕاسـتی مـن پەنـا دەگرم بە پەروەردگاری خۆم وپەروەردگاری ئێوەش لەهەموو خۆبەزلزانێك کە باوەڕی بە ڕۆژی لێپرسینەوە نییە (٢٧)} [غافر]. خوای گەورە سەبارەت بە مەسیح (عیسا) -علیە السلام- لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: کە عیسا -علیە السلام- فەرموویەتی: {إِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ (٥١) بە ڕاستی خوا پەروەردگاری من وئێوەیە دەی بیپەرستن ئەمەیە ڕێگای ڕاسـت (٥١)} [آل عمـران]. وهەروەهـا خـودا سەبارەت بە مەسیح (عیسا) -علیە السلام- لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: کە عیسا -علیە السلام- فەرموویەتی: {يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ إِنَّـهُ مَـن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَـارٍ (٧٢) ئەی بەنـو ئیسرائیل تەنها خوا بپەرستن کە پەروەردگاری من و ئێوەشـە بەڕاسـتی هەرکەسـێک

هاوبەش بۆ خودا دابنێت ئەوە بێگومان خودا بەهەشتی لـێ حەرام کـردووە، وجێگـا وشوێنی ئاگر دەبێت وە بۆ ئەو ستەمکارانە هیچ یارمەتیدەرێک نییە (٧٢)} [المائدة].

تەنانەت لە تەورات وئینجیلیشـدا دووپـاتکردنەوە هـاتووە لەسـەر پەرسـتنی خودا بە تەنها وبە بێ بڕیاردانی هیچ شەریک وهاوبەشێک لە پەرستنیدا، لە (سیفری دووەم)دا هاتووە کە موسا -علیه السلام- دەفەرموێت: (اسمع یا إسرائیـل الـرَّب إلهنـا رب واحد) واتە: (گوێبگرن ئەی نەوەکانی ئیسـرائیل، -الـله- خـودا پەروەردگارمـانە، یەک پەروەردگــار هەیە). ودووپــاتکردنەوە هــاتووە لەســەر تەوحیــد -یەک خــودا پەرستی- لە (ئینجیلی مرقس)دا، کە مەسیح (عیسا) -علیـە السـلام- دەفەرموێـت: (إن أول الوصایا هي: اسمع یا إسرائیل الرَّب إلهنا رب واحد) واتە: (یەکەم وەسـیەت -ئامۆژگــاری- بــریتیە لە: گــوێبگرن ئەی نەوەکــانی ئیســـرائیل، -الــله- خــودا پەروەردگارمانە، یەک پەروەردگار -خودا- هەیە).

وخوای گەورە ئەوەی ڕوونکـردووەتەوە کە هەمـوو پێغەمـبەران نێـردراون بـۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە مەزنە کە بریتیە لە بـانگەوازی کـردن بـۆ تەوحیـد (یەک خودا پەرستی)، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُـولًا أَنِ اعْبُـدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى اللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْـهِ الضَّـلَالَةُ} واتە: {سـوێند بە خـودا لە نـاو هەمـوو گەل وئوممەتێکـدا پێغەمـبەرێکمان نـاردووە (کە فەرمان دەکەن بەخەڵکی) بەوەی تەنها خودا بپەرستن و دوورکەونەوە لە (پەرستنی) هەرپەرستراوێکی تر، بۆیە خودا هەندێکی لەو (ئوممەتانە) ڕێنمونی کرد (هیدایەتی دان) وهەندێکیشـیان (لەبەر خراپیـان) گـومڕایی یەخەی گـرتن} [النحـل: ٣٦]. وهەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: {قُلْ أَرَأَيْتُمْ مَـا تَـدْعُونَ مِـنْ دُونِ اللَّهِ أَرُونِي مَـاذَا خَلَقُوا مِنَ الأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي السَّمَاوَاتِ اِئْتُونِي بِكِتَابٍ مِنْ قَبْـلِ هَـذَا أَوْ أَثَـارَةٍ مِـنْ عِلْمٍ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ} واتە: {(ئەی موحەممەد -صلی الله علـیە وسـلم-) بڵـێ: پـێم

بڵێن ئەو شتانەی ئێوە دەیانپەرستن جگە لە خودا پیشانم بدەن لە زەویدا چیان دروست کردووە یان لە (دروست کردنی) ئاسمانەکاندا بەشداریان کردووە، دەی پەڕاوێکم بۆ بهێنن لە پێش ئەم (قورئانە هاتبێت) یان زانیاریەك كە لە پێشووان بەجێ مابێت ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن} [الأحقاف:٤].

شێخ سەعدی -ڕەحمەتی خوای لێبێت- دەڵێت: (خوای گەورە دەزانێت کە مشتومڕی موشریکەکان سەبارەت بە شیرک بڕیاردانیان هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە، بەڵکو تەنها پشت دەبەستن بە گومانی درۆ وڕا وبۆچوون وئەقڵ وتێگەیشتنی پوچەڵ، وئەوەی کە نیشانەی پوچەڵی ئەم بەڵگانەیە ئەگەر سەیری حاڵ وزانستیان بکەیت وسەیری حاڵی ئەوانە بکەیت کە تەمەنیان بەسەربرد لە پەرستنی -مەبەست پەرستنی ئەو پەرستراوانەیە جگە لە خوای گەورە-ئایا هیچ سوودێکی پێگەیاندن لە دونیا وقیامەتدا ؟) [تیسیر الكريم المنان: ٧٧٩].

## ٦. الله -سبحانه وتعالى- خۆی پەروەردگارە وخولقێنەرە -الخالق-ە، وتەنها ئەو شایەنی پەرستنە بە بێ هیچ هاوبەش وشەریکێک، ونابێت لەگەڵ پەرستنی خودا هیچ شتێکی تر بپەرسترێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (٢١) واتە: {ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان بپەرستن کەئێوەو ئەوانەی پێش ئێوەشی دروست کردووە بەڵکو بەو پەرستنە خۆتان بپارێزن (٢١) الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ فِرَاشًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَّكُمْ فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ (٢٢) } واتە: {ئەو( خودایەی) کەزەوی بۆ ڕاخستوون وئاسمانی بۆ کردوون بە کۆشک (ئاسمانی بۆ گێڕاون بە گومەزی) وئاوی (بارانی) لەئاسمانەوە هێناوەتە خوارەوە ئەمجا دەری هێناوە بەو ئاوە هەموو

جۆره میوه وبەروبوومێک بۆ ڕۆزی ئێوه کەواته هاوتا وشەریک بۆخودا پەیدامەکەن، لە کاتێکدا ئێوه خۆتان دەزانن (بێ هاوتایه -بێ شەریکه-) (٢٢)} [البقرة:٢١-٢٢]. ئەو زاتەی کە ئێمەی خوڵقانـدووه ونەوەکـانی پـێش ئێمەشـی خوڵقانـدووه وزەوی وەکـو ڕاخەر بۆمان داخستووه کە بەسەریدا ڕێـبکەین ولە ئاسـمانەوه ئـاو وبـارانی بۆمـان دابەزانـدووه بـۆ ئەوەی بەرووبـومی جۆراوجـۆر وەکـو ڕزق ورۆزیـیەک بـۆ ئـێمه دەربچێت؛ تەنها ئەو زاته مەزنه شایستەی پەرستنه -سبحانه وتعـالی-، خـوای گەوره دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَـيْرُ اللَّهِ يَـرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ} واته: {ئەی خەڵکینه بیـربکەنەوه لە فەزڵی خودا بە سەرتانەوه ئایا بێجگە لە خودا دروسـتکارێکی -خـوڵقێنەرێکی- تـر هەیه کە ڕۆزیتان بدات لە ئاسمان وزەویـدا هـیچ پەرسـتراوێکی ڕاسـت وهەق نیـیه بێجگە لە خودا دەی چۆن وا ڕوو وەردەگێڕن (لەیەک خـودا پەرسـتی)} [فـاطر:٣].

ئەو زاتەی کە خـوڵقێنەر ودروسـتکاره و ڕزق ورۆزی دەدات تەنهـا ئەو شایسـتەی پەرستنه، خوای گەوره دەفەرموێت: {ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ خَـالِقُ كُـلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ} واته: {هەر ئەو خودایەیه کە پەروەردگاری ئێوەیه هیچ پەرسـتراوێکی ڕاسـت وهەق نیـیه جـگە لە ئەو زاته کە دروسـتکەری هەمـوو شتێکه کەواته تەنهـا ئەو بپەرسـتن وئەو خـودایه توانـا ودەسـەڵاتی بەسـەر هەمـوو شتێک هەیه وپارێزەری هەموو شتێکه} [الأنعام: ١٠٢].

هەموو ئەوانەی دەپەرسترێن جگە لە خوای گەوره شایسـتەی پەرسـتن نـین، چونکە خاوەنی تەنها هێندەی گەردیلەیەکیش نین ودەسەڵاتیان نیـیه بە سـەریدا نە لە ئاسـمانەکان ونە لە زەویـدا، ولە هـیچ شـتێک شـەریک وهاوبەشـی خـودا نـین ویـارمەتی وپشـتیوانی خـودا نـین چـونکە خـودا پێویسـتی بە هـیچ یەکێـک لە بوونەوەرەکان نییه، ئیتر چۆن داوا وپاڕانەوه نزا لە یەکێکی تر دەکەن جـگە لە خـودا

یان چۆن بانگەشەی ئەوە دەکەن کە خودا هـاوبەش وشـەریکی هەیە، خـوای گەورە دەفەرموێـت: {قُـلِ ادْعُـوا الَّـذِينَ زَعَمْـتُم مِّـن دُونِ اللَّهِ لَا يَمْلِكُـونَ مِثْقَـالَ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُ مِنْهُم مِّن ظَهِـيرٍ } واتە: {(ئەی موحەممەد -صلى الله عليه وسلم-) بڵێ هاوار بکەن لەوانەی کە بێجگە لە خودا بە پەرستراوتان دەزانین هێندەی هەرە وردیلەیەکیـان بەدەسـت نیـیە نە لە ئاسـمانەکان ونە لە زەویـدا وە ئەو پەرسـتراوانە هاوبەشـی (خـودا) نەبـوون نە لە دروسـتکردنی ئاسمانەکان ونە لە دروستکردنی زەویدا وهیچ یەك لەوان یارمەتیدەری خودا نەبوون} [سبأ: ٢٢]. وخودا -سبحانە وتعـالى- ئەو زاتەیە کە بوونەوەرەکـانی دروسـتکردووە لە نەبوونەوە وبـوونی ئەم بـوونەوەرانە بەڵـگەن لەسـەر بـوونی خـودا وپەروەردگـارێتی و(ئولوهیەتی) خودا، خوای گەورە دەفەرموێت: { وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُـرَابٍ ثُـمَّ إِذَا أَنـتُم بَشَـرٌ تَنتَشِـرُونَ(٢٠) ولە نیشـانەکانی ئەو (خـودایە) کە ئێـوەی لە خـاك دروستکردووە لە پاش (ماوەیەك) کتوپڕ ئێوە ئادەمین وبڵاوبوونەتەوە بەسـەر زەویـدا (٢٠) وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَـلَ بَيْـنَكُم مَّـوَدَّةً وَرَحْمَـةً إِنَّ فِي ذَٰلِـكَ لَآيَـاتٍ لِّقَـوْمٍ يَتَفَكَّـرُونَ (٢١) ولە ئـایەت ونیشـانەکانی ئەو (نیشانەکانی خوا) کە بۆی دروست کردوون لە (ڕەگەزی) خۆتـان هاوسـەرانێک بـۆ ئەوەی ئارام بگرن لە لایانـدا وخۆشەویسـتی وبەزەیـی خسـتۆتە نێوانتـان بەڕاسـتی لەوەدا بەڵگە ونیشانەی زۆر هەیە بۆ کەسانێك کە بیردەکەنەوە (٢١) وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْـقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّـلْعَالِمِينَ (٢٢) ولە نیشـانەکانی (دەسـەڵاتی) ئەو دروسـتکردنی ئاسـمانەکان وزەوی وجیـاوازی زمـان وڕەگەز وڕەنگتانە بەڕاسـتی لەوەدا (ئەوەی باسـکرا) بەڵـگەی زۆر هەیە بـۆ زانایـان (٢٢) وَمِنْ آيَاتِهِ مَنَامُكُم بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَابْتِغَاؤُكُم مِّن فَضْلِهِ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَـاتٍ لِّقَـوْمٍ يَسْمَعُونَ (٢٣) ولە ئایەت ونیشانەکانی ئەو (ئایەتەکـانی خـودا)، خەوتنتـان بە شـەو

وڕۆژدا وهەوڵدانتان (لە ڕۆژدا) بۆ سوود وەرگرتن لە فەزڵ وبەخششی (ڕۆزی) خوا بەڕاستی لەوەدا بەڵگە ونیشانەی زۆر هەیە بۆ کۆمەڵێك ببیستن (٢٣) وَمِنْ آيَاتِهِ يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَيُحْيِي بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ (٢٤) لە نیشانەکانی (خوایە) کە هەورە بروسکەتان نیشان دەدات بۆ ترسان و ئومێد بوون (ترسان لە هەورە بروسکە و ئومێد بوون بە باران بارین) لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێت کە زەوی دوای مردنی بەهۆی ئەو بارانەوە دەبوژێنێتەوە بەڕاستی لەوەدا (کە باسکرا) چەند بەڵگە و نیشانە هەیە بۆ ئەوانەی ژیریان بەکاردەهێنن (٢٤) وَمِنْ آيَاتِهِ أَن تَقُومَ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ بِأَمْرِهِ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ الْأَرْضِ إِذَا أَنتُمْ تَخْرُجُونَ (٢٥) ولە نیشانەکانی ئەوە کە ئاسمان و زەوی بە فەرمانی ئەو وەستاون پاشان کاتێک (لە ڕۆژی دواییدا) لە زەویەوە بانگتان دەکەن یەکسەر ئێوە (لە گۆڕەکانتان) دێنە دەرەوە (٢٥) وَلَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلٌّ لَّهُ قَانِتُونَ (٢٦) ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدایە تەنها موڵکی خوایە هەموویان هەر بۆ ئەو (خوایە) گەردن کەچن (ملکەچن) (٢٦) وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ ...(٢٧) ئەو (خوا) زاتێکە بەدیهێنانی دەستپێکردووە لە پاشان (دوا مردنی بوونەوەر) دووبارە دروستی دەکاتەوە ئەم (دروستکردنەوەی دووەم) لای خوا ئاسان ترە ...(٢٧)} [الروم: ٢٠ - ٢٧].

ونەمرود ئینکاری دەکرد لە هەبوونی خودا، بەڵام ئیبراهیم -عليه السلام- پێی فەرموو؛ هەروەکو خوای گەورە سەبارەت بەم باسەی ئیبراهیم -عليه السلام- لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: کە ئیبراهیم -عليه السلام- فەرموویەتی: {قَالَ إِبْرَاهِيمُ فَإِنَّ اللَّهَ يَأْتِي بِالشَّمْسِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ الْمَغْرِبِ فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ} واتە: {ئیبراهیم ووتی: بێگومان خوا خۆر لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدەهێنێت (ئەگەر دەتوانیت) تۆ لە ڕۆژئاواوە هەڵیبێنە ئینجا دەم کوت بوو ئەو

بێبـاوەڕە (نەمـروود) وخـوا ڕێنمـونی گەلـی سـتەمكاران ناكـات} [البقـرة: ٢٥٨].
وهەروەها ئیبراهیم -علیه السلام- بەڵـگەی ئەوەی هێنـایەوە لە سـەر قەومەكەی كە خودا ئەوی هیدایەت داوە وخۆراكی پێبەخشیووە وتینوویەتی لەسەر لادەبات وئەگەر نەخـۆش بكەوێـت شـیفای دەدات وئەو زاتە ئەو دەمرێنێـت ودیسـانەوە زینـدووی دەكاتەوە؛ هەروەكو خوای گەورە سـەبارەت بەم بەڵـگە هێنـانەوەی ئیبراهـیم -علیـە السلام- لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: كە ئیبراهـیم -علیـە السـلام- فەرمـوویەتی: {الَّـذِي خَلَقَنِــي فَهُــوَ يَهْـدِينِ (٧٨) ئەو منـی دروسـتكردووە پاشـان هەر ئەویـش ڕێنموونیم دەكات (٧٨) وَالَّذِي هُـوَ يُطْعِمُنِـي وَيَسْـقِينِ (٧٩) وهەر ئەو زاتە خـۆراك وئاوم پێدەبەخشێت (٧٩) وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ (٨٠) وكاتێك نەخۆش بكەوم هەر ئەو شیفام دەدات -چاكم دەكاتەوە- (٨٠) وَالَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحْيِـينِ (٨١) وزاتـێكە كە من دەمرێنێت و پاشان زیندووم دەكاتەوە (٨١)} [الشـعراء: ٧٨ -٨١]. وخـوای گەورە سەبارەت بە گفتوگۆی موسـا -علیـە السـلام- لەگەڵ فیـرعەون لە قورئـانی پیـرۆزدا دەفەرموێت: كە موسا -علیـە السـلام- بەڵـگەی هێنـایەوە لەسـەر فیـرعەون وپێـی فەرموو: كە پەروەردگاری ئەو زاتەیە كە: { الَّذِي أَعْطَىٰ كُـلَّ شَيْءٍ خَلْقَـهُ ثُـمَّ هَـدَىٰ} واتە: {(موسـا) فەرمـووی: پەروەردگـاری ئـێمە ئەو زاتەیە كەهەمـوو شـتێكی بەشێوەیەكی ڕێكوپێك وجوان دروستكردووە پاشان ڕێنمونیشی كـردووە (بـۆ كـاری خۆی)} [طه: ٥٠ ]. وخوای گەورە هەموو ئەو شتانەی لە ئاسـمانەكان وزەویـدان بـۆ مرۆڤ فەراهەمی كردووە ودەوروپشتی مـرۆڤ هەمـووی نیعمەتـی خـوای گەورەیە؛ ئەمانە هەمووی بۆ ئەوەیە مرۆڤ خودای لە بیر بێت وبیپەرستێت وكـوفر وبێبـاوەڕ نەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: {أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَـا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً  وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ} واتە: {ئایا نەتانزانیووە كە بەڕاستی خودا ئەوەی لە ئاسمانەكان

ولەزەویدان بۆ ئێوەی فەراهەم کـردووە ونیعمەتەکـانی ڕشـتووە بە سـەرتاندا چ دیـار وئاشکرا و چ پەنهان ونادیارە هەندێك لە ئادەمی گفتوگۆ ودەمەقاڵێ دەکەن لە بـارەی خـوداوە بەبـێ هـیچ زانیـاریەك یـان ڕێنمـونییەك یـان کتێبێکـی ڕوون وئاشـکرا} [لقـمان:٢٠]. هەروەکـو چـۆن خـوای گەورە هەمـوو شـتێکی فەراهەم کـردووە بـۆ ئادەمیزاد لە ئاسمانەکان وزەویـدا بەهەمـان شـێوە بیسـتن وبینـین ودڵ وبیرکـردنەوە وتێگەیشتنی پێبەخشیووە بۆ ئەوەی ئەو زانستە فێر ببێت کە سوودی پێـدەگەیەنێت ولە پەروەردگاری نزیکی دەکاتەوە، خوای گەورە دەفەرموێـت: { وَاللَّهُ أَخْـرَجَكُم مِّـن بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ } واتە: {خودا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێناوە کە هیچتان نەدەزانـی وخـودا گـوێ وچاو ودڵی پێدان بۆ ئەوەی سوپاسی بکەن}[النحل:٧٨].

خــوای گەورە -ســبحانە وتعــالی- هەمــوو ئەم بــوونەوەرانە ومرۆڤیشــی دروستکردووە وهەموو ئەو ئەندام وتوانا پێویستانەی پێـی بەخشـیووە بـۆ پەرسـتنی خـودا ونیشــتەجێبوون لەســەر زەوی وهەروەهــا هەمــوو ئەوانەی لە ئاسـمانەکان وزەویدایە بـۆ مـرۆڤ فەراهەمـی کـردووە. وخـوای گەورە ئەم بـوونەوەرە مەزنـانەی دروستکردووە کە بەڵگەن لەسەر پەروەردگارێتی خودا وهەروەها بەڵگەن بـۆ ئەوەی کە تەنها خودا شایەنی پەرستنە بە هەق وهەموو پەرسـتراوێکی تـر جـگە لە خـوای گەورە پوچەڵ وناهەقە پەرستنی، خوای گەورە -سبحانە وتعالی- دەفەرموێت: {قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّنْ يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَنْ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَنْ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ} واتە: {(ئەی موحەممەد -صلی الله علیه وسلم-) بڵێ: ئایا کێ ڕزق وڕۆزیتـان دەدات لە ئاسـمان (بە باران) ولە زەویەوە (بە ڕووەک) یان کێ خاوەنی (دروسـتکاری) گـوێ وچـاوانە وکێ زیندوو لە مردوو دەردەهێنێت ومـردوو لەزینـدوو دەردەهێنێـت هەروەهـا کـێ

کارەکان هەڵدەسوڕێنێت بێگومان یەکسەر دەڵـێن خـودا کەواتە (ئەی مـوحەممەد -صلى الله عليه وسـلم-) پێیـان بڵـێ: دەی بـۆ خۆتـان ناپـارێزن (لەسـزای خـودا؟)} [يونس: ٣١]. وخوای گەورە -سبحانه وتعالى- دەفەرموێت: {قُلْ أَرَأَيْتُمْ مَا تَدْعُونَ مِـنْ دُونِ اللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا مِنَ الأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي السَّمَاوَاتِ اِئْتُونِي بِكِتَابٍ مِنْ قَبْلِ هَذَا أَوْ أَثَارَةٍ مِنْ عِلْمٍ إِنْ كُنْـتُمْ صَـادِقِينَ} واتە: {(ئەی مـوحەممەد -صـلى الـله علـيه وسلم-) بڵێ: پێم بڵێن ئەو شتانەی ئێوە دەیانپەرستن جگە لە خودا پیشانم بـدەن لە زەویدا چییان دروست کردووە یـان لە (دروسـت کردنـی) ئاسـمانەکاندا بەشـداریان کردووە، دەی پەڕاوێکم بۆ بهێنن لە پێش ئەم (قورئانە هاتبێت) یان زانیـاریەك کە لە پێشـووان بەجـێ مابێـت ئەگەر ئێـوە ڕاسـتگۆن} [الأحقـاف: ٤]. وخـوای گەورە دەفەرموێت: { خَلَقَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا وَأَلْقَىٰ فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَابَّةٍ وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ (١٠) هَٰذَا خَلْقُ اللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ الَّذِينَ مِن دُونِهِ بَلِ الظَّالِمُونَ فِي ضَلَالٍ مُّبِـينٍ (١١)} واتە: { (خوا) ئاسمانەکانی دروستکردووە بەبێ هیچ کۆڵەکە وئەستوونێك کە ئێوە ببینـنن و لە زەویـدا چەنـدان شـاخی لەنـگەر داکوتـاوی دانـاوە بـۆ ئەوەی نەتانلەرزێنێـت و نەجوڵێت لە ژێرتاندا لە هەموو جۆرە زیندەوەرێکی تێدا بڵاوکردۆتەوە ولە ئاسـمانەوە بارانمان باراندووە بەهۆی ئەو (بارانەوە) لە زەویدا هەموو جۆرە ڕووەکێکی بە کەڵـك و جوانمان ڕواندووە (١٠) ئەمەی (باسکرا) دروسـتکراوی خـوایە دەی نیشـانم بـدەن ئەو (بت و پەرستراوانە)ی جگە لە خودا چییان دروسـتکردووە (هیچیـان دروسـت نەکردووە) بەڵکو ستەمکاران لە گـومڕایی یەکـی ئاشـکرادان (١١)} [لقـمان:١٠-١١]. وخوای گەورە -سبحانه وتعالى- دەفەرموێت: { أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ (٣٥) ئایـا ئەوان (بـێ خولقێنەرێـک) لە خۆیـانەوە دروسـت بـوون یـان خۆیـان (خولقێنەر) ودروستکەری خۆیانن؟ (٣٥) أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بَل لَّا يُوقِنُونَ

(٣٦) ئەی ئایا ئەوان ئاسمانەکان وزەوییان دروست کـردووە (نەخێـر وا نـیە) بەڵکـو دڵنیا نین وگومانیان هەیە (٣٦) أَمْ عِندَهُمْ خَزَائِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ الْمُصَيْطِرُونَ (٣٧) ئەی ئایا گەنجینەکـانی پەروەردگـاری تـۆ لای ئەوانە؟ یـان ئایـا هەر ئەوان دەسـەڵاتدار وزاڵن؟ (٣٧)} [الطور:٣٥ ٣٧ ].

شێخ سـەعدی -ڕەحمەتـی خـوای لێبێـت- دەڵێـت: (ئەم بەڵـگە هێنـانەوەیە لەسەریان هیچ بژاردەیەکیان بۆ جێناهێڵێت جگە لە ملکەچ بوون بۆ هەق یان ئەوەتا دەبێت لابدەن لەوەی کە داواکراوە لە لایەن ئەقـڵ وئـاینەوە) [تفسـير ابـن سـعدي: ٨١٦].

## ٧. الله خولقێنەری هەمـوو شـتێکە کە لە گەردوون وئاسـمانەکاندا هەیە لەو شتانەی دەیانبینین ولەو شتانەش کە نایان بینین، هەموو شتێک جگە لە (الله) دروستکراوە ومەخلوقە، وخوای گەورە ئاسـمانەکان وزەوی لە شەش ڕۆژدا دروستکرد.

خـوای گەورە دەفەرموێـت: {قُـلْ مَـن رَّبُّ السَّـمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ قُـلِ اللَّهُ قُـلْ أَفَاتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ لَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلَا ضَرًّا قُلْ هَلْ يَسْـتَوِي الْأَعْمَـىٰ وَالْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ أَمْ جَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ خَلَقُوا كَخَلْقِـهِ فَتَشَـابَهَ الْخَلْقُ عَلَيْهِمْ قُلِ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ} واتە: {(ئەی مـوحەممەد - صلى الله عليه وسلم-) بڵێ: کێ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویە بڵـێ خـوا ئینجـا بڵێ دەی ئێوە بێجگە لە ئەو (خوای گەورە) پشتیوانانێکتان هەڵبژاردووە (بۆ خۆتان) کە خاوەنی هـیچ سـوود و زیانێـک نـین بـۆ خۆشـیان بڵـێ ئایـا کـوێر و چـاو سـاغ یەکسانن؟ یان ئایـا تاریکیەکـان و ڕوونـاکی وەک یەک وان؟ نەخێـر ئەوانە چەنـد

هاوبەشێکیان بۆ خوا داناوە؟ (گوایە) وەک دروستکراوانی خوایان دروست کردبێت؟ ئەوسا دروست کراوەکەیان لێ شێواوە!! بڵێ خوا دروستکەری هەموو شتێکە و هەر ئەویشە تاک و تەنها و زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا} [الرعد:١٦]. وخوای گەورە دەفەرموێت: { وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ} واتە: {وخودا شتی وا دروست دەکات کە (ئێستا) ئێوە نایزانن} [النحل:٨]. خوای گەورە ئاسمانەکان وزەوی لە شەش ڕۆژدا دروستکردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: {هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ۚ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۖ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ} واتە: {(خوا) ئەو زاتەیە کە ئاسمانەکان وزەوی دروست کردووە لە شەش ڕۆژدا پاشان بەرزبویەوە بۆ سەر عەرش (باوەڕمان پێیەتی بەو شێوەی شیاوی خوا بێت، وە چۆنیەتیەکەی نازانین، تەنها خوا خۆی دەزانێت) دەزانێت چی دەچێتە ناوی زەوی وچی لێ دێتە دەرەوە وچی لەئاسمانەوە دێتە خوار وچی بۆ سەردەکەوێت و لە هەر کوێ بن خوا لەگەڵتانە (بە زانیاری و ئاگاداری) و خوا بینایە بەهەر کردەوەیەک کە دەیکەن} [الحديد:٤]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ } واتە: {سوێند بە خوا بێگومان دروستمان کردووە ئاسمانەکان وزەوی و هەرچی لە نێوانیاندایە، لە شەش ڕۆژدا و هیچ ماندوو بوونێکمان تووش نەبوو} [ق:٣٨].

### ٨. وخودا -سبحانه وتعالى- هیچ شەریک وهاوبەشێکی نییە نە لە موڵکیدا، نە لە خوڵقاندندا، ونە لە بەڕێوەبردندا، ونە لە پەرستندا.

خوای گەورە دەفەرموێت: {قُلْ أَرَأَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا مِنَ الأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي السَّمَاوَاتِ ائْتُونِي بِكِتَابٍ مِنْ قَبْلِ هَذَا أَوْ أَثَارَةٍ مِنْ

عِلْمٍ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ} واته: {(ئەی موحەممەد -صلى الله علـيه وسـلم-) بڵـێ: پـێم بڵێن ئەو شتانەی ئێوە دەیانپەرستن جـگە لە خـودا پیشـانم بـدەن لە زەویـدا چیـان دروست کردووە یان لە (دروسـت کردنـی) ئاسـمانەکاندا بەشـداریان کـردووە، دەی پەڕاوێکم بۆ بهێنن لە پـێش ئەم (قورئـانە هاتبێـت) یـان زانیـاریەك کە لە پێشـووان بەجێ مابێت ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن} [الأحقاف:٤].

شێخ سەعدی -ڕەحمەتی خوای لێبێت- دەڵێـت: {قُـلْ} واتە: بڵـێ بە ئەوانەی هاوبەشیان بۆ خوا داناوە بە پەرستنی بتەکان لە کاتێکدا نە سوودیان هەیە و نە زیان و نـە مـردن و نە ژیـان، و نـە زینـدووکردنەوە، پێیـان بڵـێ -ڕوونی بـکەرەوە بۆیـان دەستەوسـانی پەرسـتراوەکانیان کـە بێگومـان ئەوانە شایسـتەی هـیچ جۆرێـک لـە بەندایەتیکردن نین-: {أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا مِنَ الْأَرْضِ أَمْ لَهُـمْ شِرْكٌ فِي السَّـمَاوَاتِ} واتە: {پێم نیشان بدەن لە زەویدا چییان دروستکردووە یان لە دروسـتکردنی ئاسـمانەکاندا بەشداریان کردووە}، ئایا هیچ شتێکیان لە ناو ئاسمانەکان و زەویدا دروسـتکردووە؟ ئایا کێوەکانیان دروستکردووە؟ ئایا دەریایان بەڕێخسـتووە؟ ئایـا ئاژەڵەکانیـان بـڵاوە پێکردووە؟ ئایا دارودرەختەکانیان سەوز کردووە؟ ئایـا یـارمەتی دەرێکیـان هەیـە لـە دروستکردن شتێ لەوانە؟ نەخێر هیچ شتێک لەوانـە نییـە، بەوەی کـە خۆیـان دانی پێدادەنێن، ئەمە بێجگە لە باسکردنی دانپێدانانی ئەوانی تر، وئەمە بەڵگەیەکی ئەقڵی یەکلاکەرەوەیە لەسەر ئەوەی بێگومان بەندایەتی کـردن بـۆ جـگە لە خـودا شـتێکی پووچە. پاشان باسی نەبوونی بەڵگەی دەقی -نەقڵـی- کـردووە وفەرمـوویەتی: {ائْتُـونِي بِكِتَابٍ مِّن قَبْلِ هَٰذَا} واتە: {دەی پەڕاوێکم بۆ بهێنـن لە پێش ئەم قورئـانە هاتبێـت}، کتێبێک بانگەشە بکات بۆ هاوبەشدانان، {أَوْ أَثَارَةٍ مِّنْ عِلْمٍ} واتە: {یـان زانیـارییەک بەجێمابێت لە پێغەمـبەرانەوە فەرمـان بەوە بکـات}. بێگومـان ئەوەی زانـراوە ئەوان دەستەوسـانن کە لە یەکێـک لـە پێغەمـبەرانەوە بەڵـگەیەک بهـێنن لەسـەر

هاوبەشدانانیان، بەڵكو دڵنیایین هەموو پێغەمبەران بانگەشەیان كردووە بۆ لای یەكتاپەرستی پەروەردگاریان و ڕێگرییان كردووە لە هاوبەشدانان، ئەمەش مەزنترین میراتە لەوانەوە بەجێمابێت لە زانست وزانیاری. [تفسير ابن سعدي: ٧٧٩].

و (الله) -سبحانه وتعالى- موڵكی هەموو شتێك تەنها بۆ ئەو زاتەیە -مالك الملك-ە وهیچ هاوبەش وشەریكێكی نییە لە موڵك وخاوەندارێتیدا، خوای گەورە دەفەرموێت: { قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاءُ وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَاءُ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ } واتە: { بڵێ ئەی خودای خاوەن دەسەڵات؛ دەسەڵات دەدەیت بە هەركەسێك كە بتەوێت ودەسەڵات دەسێنیتەوە لە هەركەسێك كە بتەوێت وبەڕێزی دەكەیت ئەوەی بتەوێت وبێڕێزی دەكەیت ئەو كەسەی بتەوێت تەنها بە دەستی تۆیە هەموو چاكەیەك بەڕاستی تۆ بەسەر هەموو شتێكدا بە توانایت } [آل عمران:٢٦]. وخوای گەورە ئەوە ڕووندەكاتەوە كە هەموو موڵك ودەسەڵاتێك تەنها بۆ ئەو زاتە مەزنەیە لە ڕۆژی قیامەتدا، هەروەكو -سبحانه وتعالى- دەفەرموێت: { يَوْمَ هُم بَارِزُونَ لَا يَخْفَىٰ عَلَى اللَّهِ مِنْهُمْ شَيْءٌ لِّمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ } واتە: {ڕۆژێك كە هەموو (لە گۆڕەكانیان دێنە دەرەوە) ئاشكرا دەبن هیچ شتێكیان لە خودا پەنهان نابێت (خوا دەفەرمووێت) ئەمڕۆ پادشایەتی ودەسەڵات بۆ كێیە (وەڵام نادرێتەوە)، (خۆی وەڵام دەداتەوە و دەفەرمووێت): هەر بۆ خوای تاك وتەنهایە كە بە سەر هەموو شتێكدا زاڵە} [غافر:١٦]. وخودا -سبحانه وتعالى- هیچ شەریك وهاوبەشێكی نییە نە لە موڵكیدا، نە لە خوڵقاندندا، ونە لە بەڕێوەبردندا، ونە لە پەرستندا، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُ وَلِيٌّ مِّنَ الذُّلِّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا} واتە: {و(ئەی موحەممەد -صلى الله عليه وسلم-) بڵێ هەموو سوپاس و ستایش هەر بۆ خوایە زاتێك كە هیچ منداڵێكی بۆ

خۆی بڕیار نەداوە و هیچ هاوبەشێکی نەبووە لە موڵک و پادشایەتیدا هیچ دۆست و یارمەتیدەرێکی نەبووە لەبەر بێ دەسەڵاتی (کەواتە) خوا زۆر بە گەورە دابنێ} [الإسراء:١١١]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا} واتە: {ئەو زاتەی کە دەسەڵاتی بەسەر ئاسمانەکان وزەویدا هەیە وهەموو موڵکی ئەون وهیچ منداڵی بۆ خۆی بڕیار نەداوە وکەس شەریک وهاوبەشی نییە لە فەرمانڕەوایی وحوکم وموڵکدا وهەموو شتێکی دروستکردووە وئەندازەی بۆ دیاری کردووە (بە چاکی لە هەموو ڕوویەکەوە)} [الفرقان:٢]. خوای گەورە پادشا (المالك)ە وهەموو شتێک موڵکی ئەوە -سبحانه وتعالى- وئەو خوڵقێنەرە (الخالق)ە، وهەموو شتێک جگە لە زاتی مەزنی خۆی بوونەوەرە وخوڵقێنراوە، وهەر خۆی کاروباری بوونەوەرەکان بەڕێوە دەبات وبۆیە ئەو زاتەی کە ئەم وەسف وموڵک ودەسەڵاتەی بێت تەنها ئەو شایەنی پەرستنە، وپەرستنی شتێک یان یەکێکی تر لەگەڵ ئەو زاتە یان پەرستنی شتێک یان یەکێکی تر جگە لە ئەو زاتە؛ نیشانەی لاوازی ئەقڵە وهەروەها شیرک وهاوبەشدانە بۆ خودا کە ئەمیش هۆکاری خراپبوونی دەرەنجامی بوونەوەرە لە دونیا وئاخیرەتدا، خوای گەورە دەفەرموێت: { وَقَالُوا كُونُوا هُودًا أَوْ نَصَارَىٰ تَهْتَدُوا قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ} واتە: {(جوولەکە و گاوڕەکان) بە (موسڵمانەکان) ووتیان: ببن بە جوولەکە یان بە گاوڕ بۆ ئەوەی بێنە سەر ڕێگای ڕاست بڵێ: بەڵکو پەیڕەویی ئاینی پاکی ئیبراهیم دەکەین کە لە هاوبەش بڕیاردەران (موشریکان) نەبووە} [البقرة:١٣٥]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَاتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلًا} واتە: {ئایا کێ ئایینی چاکتر و جوانترە (وکێ دیندارترە) لە کەسێک کە ڕووی خۆی یەکلا کردبێتەوە بۆ خوا لە هەمان کاتدا ئەو کەسە چاکەکار بێت و شوێنی ئاینی

ئیبراهیم کەوتبێت بەڕاستی و پاکی (کە بە ویستی خۆی لە بەتاڵی وگومڕایی لای داوە بۆ لای ڕاستی) و خوا ئیبراهیمی هەڵبـژارد بە دۆسـت و خۆشەویسـتی خـۆی} [النسـاء:١٢٥]. وخـوای گەورە -سـبحانە وتعـالی- ئەوەی ڕوونکـردووەتەوە کە هەرکەسێک شـوێنی ئاینێـک بکەوێـت جـگە لە ئـاینی ئیبراهیمـی خەلیـل -علیـه السلام-؛ ئەوا ئەو کەسە خۆی گێل ونەفامکردووە ودۆڕاوە، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُ وَلَقَدِ اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ} واتە: {کـێ ڕوو وەردەگێڕێـت لە ئـایینی ئیبراهـیم -علیـه السلام-؟ مەگەر کەسێک کە خۆی گێـل ونەفـام کردبێـت؟ سـوێند بێـت بێگومـان ئیبراهیممان هەڵبـژارد لە دونیـادا وبێگومـان ئەو لەڕۆژی دوایـیدا لە چاکەکـارانە} [البقرة:١٣٠].

## ٩. و (اللّٰه) -سبحانە وتعالی- باوکی کەس نەبووە، ولە دایک نەبـووە، بەڵکو لە سەرەتاوە هەر بوونی هەبووە، وهیچ شـتێک هاوشـێوەی ئەو زاتە مەزنە نییە.

خوای گەورە دەفەرموێت:{قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ (١) (ئەی مـوحەممەد -صـلی الـله علیه وسلم-) بڵێ: هەر ئەو (الله) یە -خودایە- تاکە وبێ هاوتایە (١) اللَّهُ الصَّمَدُ (٢) ئەو خودایەی بێ نیاز وجێی نیاز وئومێدی -باوەڕدارانە- (٢) لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ (٣) کەسی لێ نەبووە ولە کەس نەبووە (٣) وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ (٤) وهەرگیـز هـیچ کەس هاوشێوە وهاوتای ئەو نییە (٤)} [الإخلاص:١-٤]. وخـوای گەورە دەفەرموێـت: {رَّبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا فَاعْبُدْهُ وَاصْطَبِرْ لِعِبَادَتِهِ هَلْ تَعْلَمُ لَهُ سَمِيًّا} واتە: {پەروەردگاری ئاسمانەکان وزەوی وهەرچـی لە نێوانیانـدایە کەواتە بیپەرسـتە وزۆر خۆگر بە لە پەرستنیدا ئایا گومانـت هـەیە لەوەی کەسێـک هاوتـا وهاونـاوی ئەو

بێت! } [مريم:٦٥]. وخوای گەورە -سبحانە وتعالی- دەفەرموێت: {فَاطِرُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا وَمِنَ الْأَنْعَامِ أَزْوَاجًا يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ} واتە: {(خودا) بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویـیە، بـۆی بەدیهێنـاون هاوسـەران لە خـودی خۆتـان هەروەهـا لە ئاژەڵیشـدا جـووتی (دروستکردووە) لە جووت بووندا ژمارەتان زۆر دەکات هیچ شتێك وەکو خـودا نیـیە (نە لە زات ونە لە سیفات ونە لە کرداریدا) وئەو زاتە بیسەر وبینایە} [الشورى:١١].

## ١٠. خوای گەورە تێکەڵی هیچ شتێک نابێت وبەرجەستە نابێـت لە هـیچ یەکێـک لە بوونەوەرەکانیـدا، بەڵکـو زاتێکـی مەزن وپیـرۆزە لە سەرەوەی بوونەوەرەکانە لە سەرەوەی عەرشی مەزنە.

خوای گەورە تێکەڵی هیچ شتێک نابێت وبەرجەستە نابێت لە هـیچ یەکێـک لە بوونەوەرەکانیـدا، بەڵکـو زاتێکـی مەزن وپیـرۆزە لە سـەرەوەی بوونەوەرەکـانە لە سەرەوەی عەرشی مەزن، چونکە ئەو خودایە وجگە لە ئەو هەمووی دروسـتکراون، وجـگە لە ئەو زاتە هەمـوو شـتێک ئەگەری لە نـاوچوون ونەمـانی هەیە، وهەمـوو شـتێک مـوڵکی خـودایە بـۆیە تـێکەڵ وبەرجەسـتە نابێـت لە هـیچ یەکێـک لە بوونەوەرەکـان ودروسـتکراوەکانیدا، وهەروەهـا هـیچ یەکێـک لە بوونەوەرەکـان ودروستکراوەکان بەرجەستە وتێکەڵی زاتی مەزنی ئەو نابن، وخودا -سبحانە وتعالی- لە هەموو شتێک وکەسێک گەورەتر ومەزنترە، خوای گەورە ئینکاری کردووە لەسـەر ئەوانەی کە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە خـودا تـێکەڵ وبەرجەسـتە بـووە لە لاشـەی مەسیح (عیسا) -علیه السلام-، کە دەفەرموێت: {لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ

وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ} واته: {سوێند بێت بێباوەڕ بوون (کـافر بـوون) ئەوانەی کە ووتیان بێگومان خودا مەسیحی کوڕی مەریەمە لە کاتێکدا مەسـیح (کاتێـک ڕەوانە کرا) ووتـی ئەی نەوەکـانی ئیسـرائیل تەنهـا خـودا بپەرسـتن کە پەروەردگـاری مـن وئێوەیشـە بەڕاسـتی هەرکەسـێک هـاوبەش بـۆ خـودا دابنێـت ئەوا بێگومـان خـودا بەهەشـتی لـێ حەرام کـردووە، وجێگـا وشـوێنی ئـاگری دۆزەخ دەبێـت وبـۆ ئەو ستەمکارانە هیچ یارمەتیدەرێک نییە} [المائدة:١٧]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {وَلِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ ۚ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ وَاسِعٌ عَلِيمٌ (١١٥) ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هەر بـۆ خـوایە کەواتە ڕووبـکەنە هەرلایەک (لە نـوێژ کردنـدا بە فەرمـانی خودا) ئەوە ڕووگەیە و ڕووتان لە خودا کردووە بێگومان خوا (بەزەیـی و میهرەبـانی) فراوانە و زانایە (١١٥) وَقَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا ۗ سُبْحَانَهُ ۖ بَل لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ كُلٌّ لَّهُ قَانِتُونَ (١١٦) (گاوڕ و جوولەکە و بت پەرستەکان) وتیـان: خـوا منـداڵی بـۆ خۆی داناوە ئەو (خوا) پاک و بەدوورە لەوە؛ بەڵکـو هەرچـی هەیە لە ئاسـمانەکان و زەویدا مـوڵکی ئەوە هەمـوو فەرمـانبەردار وملکەچـی ئەون (١١٦)بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ وَإِذَا قَضَىٰ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ (١١٧) (خـوا) بەدیهێـنەری ئاسمانەکان و زەویە وکاتێک کە ویستی شتێک بکات هەر ئەوەندەی پێ دەوێـت کە پێی بڵێت: ببە، ئیتر دەبێـت (١١٧)} [البقـرة:١١٥-١١٧]. وخـوای گەورە دەفەرموێـت: {وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَٰنُ وَلَدًا (٨٨) (گاوڕ وجولەکەکان) دەیانووت خوا منداڵی بۆ خۆی داناوە (٨٨) لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْئًا إِدًّا (٨٩) سوێند بە خوا بەڕاستی شتێکی زۆر نـابەجێ و سەیر دەڵێن (٨٩) تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ الْأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدًّا (٩٠) نزیکە ئاسمانەکان لەت لەت و پارە پارە ببن لەبەر ئەو (قسەیە) و (نـزیکە) زەویـش شەق بەرێت و بقڵیشێ و(نزیکە) چیاکان بە یەکجار بڕوخێن (٩٠) أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا (٩١) لەبەرئەوەی (بێباوەڕان) منداڵ دەدەنە پاڵ خوای میهرەبان (٩١) وَمَا يَنبَغِي

لِلرَّحْمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا (٩٢) بۆ خوای میهرەبان شیاو نییە کە منداڵی هەبێت (٩٢) إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَٰنِ عَبْدًا (٩٣) هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەویدان بە بەندەیی دێنە لای خوای میهرەبان (هیچ کەسێک لەوانە نییە بەندەی خوای میهرەبان نەبێت) (٩٣) لَّقَدْ أَحْصَاهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا (٩٤) سوێند بە خوا بەڕاستی هەموویانی سەرژمێری کردووە بە ژماردن (٩٤) وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْدًا (٩٥) هەر هەموویان بە تاک و تەنها دێنەوە بۆ لای (خوا) لە ڕۆژی قیامەتدا (٩٥)}[مريم:٨٨-٩٥]. وهەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:{ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ} واتە: {الله ئەو خودایەیە کە هیچ پەرستراوێک هەق وڕاست نییە کە شایەنی پەرستن بێت جگە لە ئەو، هەمیشە زیندووە وتەدبیرکار وڕاگری (بوونەوەرەکانە)، و وەنەوز نایگرێت وناخەوێت، هەرچی لە ئاسمانەکان وزەویدایە موڵکی ئەوە، کێ هەیە لەو ڕۆژەدا بتوانێت تکا وشەفاعەت لە لای ئەو بکات مەگەر بە ڕێگاپێدان وئیزنی ئەو زاتە مەزنە نەبێت، ئاگادارە بە ئەوەی لە پێشەوەی (ئادەمی) یە و(ئەوەی لە دونیا لە بەردەستیاندایە) وئەوەی لە پاشەوەیەتی (لە ڕۆژی دوایی بۆیان ئامادەکراوە)، وکەس ئاگای نییە لە هیچ شتێک لە زانین وزانیاری ئەو (خودا) یە مەگەر بەوەی کە خۆی بیەوێت (بیبەخشێت پێیان)، کورسیەکەی* خودا هەموو ئاسمانەکان وزەوی گرتۆتەوە، وپارێزگاری کردنی ئاسمانەکان وزەوی بۆ خودا ئاسانە و(گران نییە) وهەر ئەو بڵندە پلەوپایەی مەزن وگەورەیە}.[البقرة:٢٥٥] *(کورسی: دروستکراوێکی مەزنی خودایە وعەرش لە کورسی گەورەترە، وکورسی ئەو شوێنەیە خودا پێیەکانی -لەسەری یان لە نێوی دادەنێت-). ئەگەر ئەمە مەزنی وپلەوپایەی خودا بێت وئەو

شتانەی کە دروستی کردوون هێندە مەزن بن، ئایا چۆن تێکەڵی هیچ یەکێک لە شتەکان یان بوونەوەرەکان دەبێت؟ یان چۆن دەیانکات بە منداڵی خۆی؟ یان چۆن کەسی تر لەگەڵ زاتی مەزنی خۆیدا دەکات بە خودا وپەرستراو؟ .

## ١١. (اللّٰه) -سبحانە وتعالی- بە ڕەئفەتە ومیهرەبانە بەرامبەر بە بەندەکانی بۆیە پێغەمبەرانی ناردووە وکتێبە ئاسمانیەکانی دابەزاندووە.

(اللّٰه) -سبحانە وتعالی- بە ڕەئفەتە ومیهرەبانە بەرامبەر بە بەندەکانی بۆیە پێغەمبەرانی ناردووە وکتێبە ئاسمانیەکانی دابەزاندووە؛ بۆ ئەوەی لە تاریکایی کوفر وشیرک وتاوانەوە دەریان بکات بەرەو نور ورۆشنایی وهیدایەت وپەرستنی خودا بە بێ هیچ شەریک وهاوبەش بڕیاردانێک، خوای گەورە دەفەرموێت: {هُوَ الَّذِي يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبْدِهِ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ لِّيُخْرِجَكُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ ۚ وَإِنَّ اللَّهَ بِكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ} واتە: {خوا ئەو زاتەیە دەینێرێت بۆ بەندەی خۆی (کە موحەممەدە -صلی اللە علیە وسلم-) بەڵگە وئایەتانێکی ڕوون وئاشکرا تا لەتاریکستانی (گومڕایی وبێباوەڕی) دەرتان بهێنێت بۆ ناو ڕووناکی ( ئیمان وئیسلام) و بەڕاستی خوا بەرامبەر ئێوە بەسۆز ومیهرەبان} [الحديد:٩]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ} واتە: {و(ئەی موحەممەد -صلی اللە علیە وسلم-) تۆمان تەنها بۆ ئەوە ناردووە کە ڕەحمەت بیت بۆ جیهانیان}[الأنبياء: ١٠٧].

وخودا فەرمان بە پێغەمبەرەکەی دەکات کە بە بەندەکانی بڵێت: ئەو زاتە لێخۆشبووە -الغفور-ە ومیهرەبانە -الرحيم-ە، خوای گەورە دەفەرموێت: {نَبِّئْ عِبَادِي أَنِّي أَنَا الْغَفُورُ الرَّحِيمُ} واتە: {هەواڵ بدە بە بەندەکانم کە بەڕاستی هەر من لێبوردە ومیهرەبانم} [الحجر:٤٩]. ولە ڕەئفەت ومیهرەبانی خودا بەرامبەر بە بەندەکانی ئەوەیە کە ناخۆشی وزیانیان لەسەر لادەبات وخێر وباران دادەبەزێنێت بۆ سەر بەندەکانی،

خوای گەورە دەفەرموێت: {وَإِن يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُ إِلَّا هُوَ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَادَّ لِفَضْلِهِ يُصِيبُ بِهِ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ} واتە: {وئەگەر خوا بە تۆ بگەیەنێت زیانێک هیچ لادەرێک نییە بۆ ئەو (زیانە) بێجگە لە خوا و ئەگەر خێر و خۆشیەکی بویێت بۆت ئەوا هیچ ڕێگریکەرێک نییە بۆ چاکەی خوا بەهرەمەندی دەکات ئەو کەسەی خۆی بیەوێت لە بەندەکانی و هەر ئەو لێبوردە و بە بەزەییە} [یونس:١٠٧].

## ١٢. خودا (الله) پەروەردگارێکی میهرەبانە (الرحیم)ە، وتەنها زاتی مەزنی خۆی لێپرسینەوە لە بەندەکان دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا کاتێک زیندوویان دەکاتەوە لە گۆڕەکانیان، بۆیە هەر کەسێک پاداشت دەدرێتەوە بە پێی کردەوەکەی خێر یان شەڕ بێت، ئەوەی ئیماندار بێت وکردەوەی چاک ئەنجامبدات ئەوا نیعمەت وئاسوودەیی بەردەوامی بۆ هەیە، وئەوەی کافر وبێباوەڕ بێت وکردەوەی خراپ ئەنجامبدات ئەوا سزایەکی مەزنی بۆ هەیە لە قیامەتدا.

ئەوەی دادپەروەری و دانایی و ڕەحمەتی خوایی تەواو دەسەلمێنێت بۆ بوونەوەرەکان ئەوەیە ئەم ژیانەی دروستکردووە بۆ ئەوەی شوێنی کردەوە کردن بێت وشوێنێکی تریش بۆ پاداشتی چاکە و لێپرسینەوە وسزا داناوە؛ بۆ ئەوەی چاکەکار پاداشتی چاکەی وەربگرێتەوە، وستەمکار ودەستدرێژکار سزای ستەم ودەستدرێژییەکەی وەربگرێت؛ چونکە ڕەنگە هەندێک کەس زیندووبوونەوە بە دوور بزانن، بۆیە خوای گەورە بەڵگەی زۆری باسکردووە سەبارەت بەوەی زیندووبوونەوە لە پاش مردن ڕاستی وهەقیقەتە وهچی گومانێکی تێدا نییە، خوای

گەورە دەفەرموێت: { وَمِنْ آيَاتِهِ أَنَّكَ تَرَى الْأَرْضَ خَاشِعَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ إِنَّ الَّذِي أَحْيَاهَا لَمُحْيِي الْمَوْتَىٰ إِنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ} واتە: {لە نیشانەکانی (دەسەڵاتی) خوایە کە زەوی دەبینیت وشك و ماتە کەچی کاتێك بارانمان باراند بەسەریدا (بە ڕواندنی ڕووەك) دەکەوێتە جوڵە ودەبووژێتەوە (بەرز دەبێتەوە) بێگومان ئەوەی (زەوی وشك) دەبووژێنێتەوە زیندووکەرەوەی مردووەکانیشە بەڕاستی ئەو (خوا) بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە}[فصلت:٣٩].

وخوای گەورە دەفەرموێت: { يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰ أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِن بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئًا وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ} واتە: {ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە لە گوماندان دەربارەی زیندووبوونەوە ئەوسا (بزانن) بەڕاستی ئێمە ئێوەمان دروستکردووە لە خاک (خۆڵ) پاشان (نەوەکان) لە دڵۆپە ئاوێک -نوتفەیەک- (دروست دەبن) دواتر (دەبێتە) پارچە خوێنێکی مەیو دوای ئەوە (دەبێتە) پارچە گۆشتێک شکڵ و شێوە کێشراو و شکڵ و شێوە نەکێشراو بۆ ئەوەی ڕوونی بکەینەوە بۆ ئێوە وە لە منداڵداندا دەیهێڵینەوە (ڕایدەگرین) ئەو (کۆرپەلەیەی) بمانەوێت (لەبار نەچێت) تا کاتێکی دیاریکراو پاشان (لەسکی دایکتان) دەرتان دەهێنین بە ساوایی پاشان گەورە دەبن هەتا دەگەنە تەواوی هێز و تواناتان وە (لەم تەمەنەدا) هەندێکتان دەمرێنرێت وە هەندێکتان دەگەیەنرێنە ئەو پەڕی پیری، بێ سوودترینی تەمەن بۆ ئەوەی نەزانێت و لەبیری نەمێنێت هەرچی کە دەیزانی وە زەوی دەبینی (لە زستاندا) خامۆشە ووشک و بێ گیایە جا کاتێک بارانمان بەسەردا

باراند زەوی (ڕووەکی لێ دەڕوێت و) دەجوڵێت زەوی هەڵ دەدات (بەرز دەبێت) و (زەوی) دەڕوێنێ لە هەموو جۆرە (گیا و گوڵێکی) جوان} [الحج:٥].

خوای گەورە لەم ئایەتەدا سێ بەڵگەی ئەقڵی باسکردووە کە بەڵگەن لەسەر دووبارە زیندووبوونەوەی بوونەوەرەکان لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەوانیش بریتین لە:

١- خوای گەورە مرۆڤی لە خۆڵ وخاک دروستکردووە، وکاتێک مرۆڤ دەمرێت ودەبێت بە خۆڵ ئەو خودایەی کە سەرەتا لە خۆڵ دروستی کرد؛ خودا توانادارە لەو خۆڵەی کە تێیدا لاشەی مرۆڤ ڕزیووە ونەماوە دووبارە دروست وزیندووی بکاتەوە.

٢- ئەو زاتەی کە مرۆڤی لە دڵۆپە ئاوێکەوە (مەنیەکەوە) دروستکردووە؛ توانادارە سەبارەت بەوەی کە مرۆڤ دروست وزیندوو بکاتەوە لە پاش مردنی.

٣- ئەو زاتەی کە زەوی زیندوو دەکاتەوە لە پاش باران، توانادارە لەسەر ئەوەی کە بوونەوەرەکان زیندوو بکاتەوە لە پاش مردنیان، ولەم ئایەتەدا بەڵگەیەکی مەزن هەیە لەسەر ئیعجاز ومەزنی قورئانی پیرۆز ئەم ئایەتە -کە زۆریش درێژ نییە- سێ بەڵگەی ئەقڵی سەرنجڕاکێشیان تێدایە سەبارەت بە مەسەلەیەکی زۆر مەزن.

وخوای گەورە دەفەرموێت: { يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ } واتە: {(بیهێنەوە بیریان) ئەو ڕۆژەی کە ئاسمانەکان دەپێچینەوە وەک پێچانەوە (لولکردنی) تۆماری کتێب وپەرتوکێک وەک یەکەمجار چۆن دروستمان کرد (بە ڕووت وقووتی)، پاش مردنیش ئەو (دروستکردنە) دووبارە دەکەینەوە ئەوە بەڵێنێکە (جێبەجێ کردنی) لەسەر ئێمەیە بێگومان ئێمە (ئەو بەڵێنە) بەدیدەهێنین} [الأنبياء:١٠٤]. وخوای گەورە دەفەرموێت: { وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَن يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ (٧٨) وە نموونەمان بۆ دێنێتەوە و بەدیهێنانی خۆی لە بیر چووەتەوە (ئەو بێباوەڕە) دەڵێت کێ

ئێسکەکان زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا کە ڕزیون (٧٨) قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنْشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ (٧٩) (ئەی موحەممەد -صلی الـلە علـیە وسـلم-) بڵـێ ئەو زاتە زینـــدوویان دەکـــاتەوە کە لە یەکەمجـــارەوە بەدیهێنـــاون وئەو بە هەمـــوو دروسـتکراوێك زانـا و ئاگـادارە (٧٩)} [یـس:٧٨-٧٩]. وخـوای گەورە دەفەرموێـت: {أَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَاءُ بَنَاهَا (٢٧) ئایا دروستکردنی ئێوە گرانترە یـان ئاسـمان ؟ ودروستیشی کرد (٢٧) رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا (٢٨) وئاسـمانی لـە بـان سـەرتان وەکـو بینایەك بەرز کردووە و ڕێـك خسـتووە (٢٨) وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا (٢٩) وشەوەکەی تاریـك کـرد (بە تـاریکی داپۆشـی) و ڕۆژەکەی ڕوونـاک کـردەوە (٢٩) وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَاهَا (٣٠) لە پاشـان زەوی ڕاخسـت (٣٠) أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءَهَا وَمَرْعَاهَا (٣١) ئاو ولەوەڕگای لێ دەرهێنـا (٣٠) وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا (٣٢) و شـاخەکانی پتەو دامەزراند (٣٢) } [النازعات:٢٧-٣٢].

خوای گەورە ڕوونی کردووەتەوە کە دروستکردنی مرۆڤەکـان گـرانتر نیـیە لە دروســتکردنی ئاســمانەکان وزەوی وئەوەی تێیانــدایە، ئەو زاتەی کە ئاســمانەکان وزەوی دروستکردووە بە دڵنیاییەوە توانا ودەسەڵاتی هەیە لەوەی کە مرۆڤ جارێکی تر دروست بکاتەوە.

١٣. خـودا (الله) -سـبحانه وتعـالى- ئـادەمی دروسـتكردن لە خـۆڵ (قوڕ: گـڵ) ونەوەكـانی لە پـاش خـۆی زۆر دەبـن، بـۆیە هەمـوو خەڵكـی بنچینەیان وەكو یەكە، وهیچ ڕەگەزێک فەزڵـی بە سـەر ڕەگەزێكـی تـرەوە نییە وهیچ گەلێک فەزڵی بە سەر گەلێكی ترەوە نییە؛ مەگەر بە پێی پلەی ئیمان وتەقواداری ولە خودا ترسی نەبێت.

خوای گەورە دەفەرموێـت: {يَـا أَيُّهَـا النَّـاسُ إِنَّـا خَلَقْنَـاكُم مِّـن ذَكَـرٍ وَأُنثَـىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِـيمٌ خَبِـيرٌ} واتە: {ئەی خەڵكینە بێگومان ئێمە دروستمان كردوون لە نێر ومێیەك وكردومانن بە چەند گەل وهۆزێكەوە تـا یەكـتری بناسـن، بەڕاسـتی بەڕێزترینتـان لای خـودا ئەو كەسەیە كە زیاتر لە خودا دەترسێت، بێگومان خودا زانا وئاگادارە} [الحجـرات:١٣].

وخوای گەورە دەفەرموێت: {وَاللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُـمَّ جَعَلَكُـمْ أَزْوَاجًـا ۚ وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِ ۚ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِ إِلَّا فِي كِتَابٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ} واتە: {خوا (باوكی) ئێـوەی لە خـاک دروسـتكردووە لەپاشان (نەوەكانی دروستكرد) لە دڵۆپە ئاوێک (نوتفەیەک) ئینجا (خوا) كردوونـی بە چەند جووت (نێر و مێ) وهیچ مێینەیەك (ئافرەتێك) دوو گیان نابێت وسكەكەی دانانێت (منداڵی نابێت) مەگەر بە ئاگاداری خوا نەبێت وهـیچ تەمەن درێـژ كراوێـك تەمەنی درێژ ناكرێت ولە تەمەنی كەم ناكرێت مەگەر لە كتێبێكدا (لە لوح المحفوظ )دا نوسراوە بەڕاستی ئەم كارە بۆ خوا ئاسانە} [فاطر:١١].

وخوای گەورە دەفەرموێت: {هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَـةٍ ثُـمَّ مِـنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ يُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ ثُمَّ لِتَكُونُوا شُيُوخًا ۚ وَمِنكُم مَّن يُتَـوَفَّىٰ مِـن قَبْلُ ۖ وَلِتَبْلُغُوا أَجَلًا مُّسَـمًّى وَلَعَلَّكُـمْ تَعْقِلُـونَ} واتە: {ئەو خـوایە كە ئێـوەی لە خـاك

دروستکردووه لە پاشان لە دڵۆپێك ئاو پاشان لە پارچە خوێنێك لە پاشان بە منداڵی (ساوایی) دەتانهێنێتە دەر (لە سکی دایك) لە پاشان تا دەگەنە تینی هێز ولاویتان لە پاشان تا پیر دەبن وهەندێکتان پێش پیربوون دەمرێندرێن هەتا دەگەنە ئەو کاتەی کە بۆتان دیاریکراوە وبۆ ئەوەی بیربکەنەوە}[غافر:٦٧]. وخوای گەورە ئەوە ڕووندەکاتەوە کە مەسیحی (عیسای) -علیه السلام- بە فەرمانێکی گەردوونی دروست وخەڵق کرد هەروەکو چۆن ئادەمی لە خۆڵ دروستکرد بە فەرمانێکی گەردوونی، خوای گەورە دەفەرموێت: {إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ} واتە: {بەڕاستی وێنەی (دروست بوونی) عیسا لای خوا وەک وێنەی ئادەم وایە کە دروستی کرد لە گڵ لە پاشان پێی ووت ببە، ئەویش بوو (بەمرۆڤ)} [آل عمران : ٥٩]. وپێشتر لە بڕگەی ژمارە (٢) باسکرا کە پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم- ڕوونی کردەوە کە خەڵکی وەکو یەکن وهیچ کەسێک فەزڵی بەسەر کەسێکی ترەوە نییە مەگەر بە پێی پلەی تەقواداری وئیمان ولە خودا ترسانەوە نەبێت.

## ١٤. هەموو منداڵێک لەسەر فیترەت لە دایک دەبێت.

فیترەت: ئەو سروشتەیە کە خوای گەورە مرۆڤی لەسەر دروستکردووە، بریتیە لە شتە قبوڵکراوەکان وپاکەکان لای مرۆڤ لەو کاتەوەی لە دایک دەبێت، لە گرنگترینیان: باوەڕبوون بەوەی کە یەک پەروەردگار کە (الله)یە -سبحانه وتعالی- و تەنها ئەو شایەنی پەرستنە، خوای گەورە دەفەرموێت: خوای گەورە دەفەرموێت: {فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ} واتە:{کەواتە ڕووی خۆت ڕێک بکەرە ئاینی ئیسلام وپاك و ڕاست بۆ خوا (شوێن ئاینی) یەکخواپەرستی بکەوە، ئەو

ئاینەی کە خوای گەورە (لە سەرەتاوە) فیترەتی پاکی مرۆڤی لەسەر دروستکردووە ئاین ودروستکراوەکانی خوا بە هیچ جۆرێک گۆڕانی بۆ نییە ئەو (ئاینەی باسکرا) هەر ئەوە ئاینی ڕێك وڕاستە بەڵام زۆربەی ئادەمی نازانن} [الروم:٣٠].

وحەنیفیەت ئاینی ئیبراهیمی خەلیل بووە -علیه السلام-، حەنیفیەت: واتا پەرستنی خودا (الله) بە تەنها بە دڵسۆزییەوە بە بێ بڕیاردانی هیچ شەریک وهاوبەشێک، وخۆ دوورکردنەوە وبەریئبوون وبێباوەڕ بوون: بە پەرستنی بتەکان وبە پەرستنی پەرستراوە ناهەقەکانی تر لەگەڵ خوای گەورەدا، خوای گەورە دەفەرموێت: {ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ} واتە:{پاشان نیگامان بۆ کردیت (وەحیمان بۆ ناردیت) کە پەیڕەوی ئاینی ئیبراهیم بکە چونکە پاک وڕاست بوو بە هیچ جۆرێک لە هاوبەشدانەران (موشریکان) نەبوو} [النحل:١٢٣]. وپێغەمبەری خودا -صلی الله علیه وسلم- دەفەرموێت: «مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلَّا يُولَدُ عَلَى الفِطْرَةِ فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ كَمَا تُنْتَجُ البَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ» واتە: «هەموومنداڵێک لەسەر فیترەت لەدایک دەبێت، باوک ودایکی دەیکەن بە جولەکە یان نەسرانی یان مەجوسی، هەروەکو چۆن ئاژەڵێک بێچوویەکی دەبێت کە سەلامەتە ئایا هیچ کەموکورتیەکی هەیە، پاشان تووشی کەموکورتی دەبێت وەکو گۆج بوون». پاشان ئەبو هورەیرە -ڕەزای خوای لێبێت- دەڵێت: ئەم ئایە بخوێننەوە ئەگەر ویستتان: {فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ} واتە:{کەواتە ڕووی خۆت ڕێك بکەرە ئاینی ئیسلام وپاك و ڕاست بۆ خوا (شوێن ئاینی) یەکخواپەرستی بکەوە، ئەو ئاینەی کە خوای گەورە (لە سەرەتاوە) فیترەتی پاکی مرۆڤی لەسەر دروستکردووە ئاین ودروستکراوەکانی خوا بە هیچ جۆرێک گۆڕانی بۆ نییە ئەو (ئاینەی باسکرا) هەر ئەوە ئاینی ڕێك وڕاستە بەڵام

زۆربەی ئادەمی نازانن} [الروم:٣٠] [صحيح البخاري: ٤٧٧٥]، وپێغەمبەری خـودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێـت: «أَلَا إِنَّ رَبِّي أَمَـرَنِي أَنْ أُعَلِّمَكُـمْ مَـا جَهِلْـتُمْ مِـمَّا عَلَّمَنِي يَوْمِي هَذَا كُلُّ مَالٍ نَحَلْتُهُ عَبْدًا حَلَالٌ وَإِنِّي خَلَقْتُ عِبَادِي حُنَفَاءَ كُلَّهُمْ وَإِنَّهُـمْ أَتَتْهُمُ الشَّيَاطِينُ فَاجْتَالَتْهُمْ عَنْ دِينِهِمْ وَحَرَّمَـتْ عَلَـيْهِمْ مَـا أَحْلَلْـتُ لَهُـمْ وَأَمَـرَتْهُمْ أَنْ يُشْرِكُوا بِي مَا لَمْ أُنْزِلْ بِهِ سُلْطَانًا» واتە: «پەروەردگارم فەرمانی پێکرم ئەوەتان فێر بکەم کە نایزانن، ولەو شتانەی کە لە ئەمـرۆ فێـری کـردم: هەر سـامانێک بە بەنـدەکەمم بەخشیووە بۆی حەڵاڵە، من بەندەکانم لەسەر فیترەت دروستکردووە (لەسـەر تەنهـا یەک خوا پەرستن دروستکردووە)، وشەیتانەکان بۆیان هاتن لە ئاینەکەیان دووریان خسـتنەوە، وئەو شـتانەی لەسـەریان حەرامکـرد کە مـن بۆیـانم حەڵاڵ کردبـوو، وفەرمانی پێیان کرد کە هاوبەش وشەریک بۆ من بڕیار بـدەن لە کاتێکـدا مـن هـیچ بەڵگەیەکـم سـەبارەتی دانەبەزانـدووە (سـەبارەت بەم هـاوبەش بڕیـاردانە دانەبەزاندووە)» [رواه مسلم: ٢٨٦٥].

## ١٥. هیچ مرۆڤێک بە گوناهباری وتاوانباری لە دایک نابێت ونـابێتە میراتگری تاوانی هیچ مرۆڤێکی تر.

واتا تاوانی هیچ مرۆڤێک ناکەوێتە ئەستۆی مرۆڤێکی تر (ئەگەر مرۆڤی یەکەم هۆکار نەبوو بێت بـۆ ئەوەی ئەو مـرۆڤەکەی تـر ئەو تـاوانە ئەنجامبـدات). وخـوای گەورە باسی ئەوە دەکات بۆ ئـێمە کاتێـک ئـادەم -علیـە السـلام- وهاوسـەرەکەی لە دارەکەیان خوارد وسەرپێچی فەرمانی خودایان کرد؛ لە پاشاندا تەوبەیان کـرد وداوای لێخۆشبوونیان لە خـوای گەورە کـرد، بـۆیە خـوای گەورە ئیلهـامی وتنـی هەنـدێک وشەی جوانی پێی بەخشین، بۆیە ووتیان وخـوای گەورە تەوبەکەی لێیـان قبـوڵکرد،

خوای گەورە دەفەرموێت: { وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ (٣٥) وە ووتمان: ئەی ئادەم خۆت و هاوسەرەکەت نیشتەجێ بن لەم بەهەشتەدا وە لە هەموو خواردەمەنیەکی تێر بخۆن لە هەر شوێنێک کە حەز دەکەن وە نزیکی ئەم درەختە مەکەون تا لە ستەمکاران نەژمێردرێن -تا نەبنە ستەمکار- (٣٥) فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلْنَا اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِيمَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلَّا يُولَدُ عَلَى الفِطْرَةِ فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ كَمَا تُنْتَجُ البَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَ الْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَىٰ حِينٍ (٣٦) ئەمجا شەیتان هەڵیخەڵەتاندن لە بەهەشتدا ولەو خۆشگوزەرانییەی کە تێیدا بوون دەریپەڕاندن و ووتمان: (بە ئادەم وحەوا وشەیتان) بچنە خوارەوە (بۆ سەر زەوی) هەندێکتان دەبن بە دوژمنی هەندێکی ترتان وبۆتان هەیە جێگیربن لەسەر زەوی وچێژ لە ئارەزووەکانی (دونیا) وەربگرن هەتا ماوەیەک (٣٦) فَتَلَقَّىٰ آدَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ (٣٧) ئەمجا ئادەم چەند ووتەیەکی (پاڕانەوەی ) لە پەروەردگارییەوە وەرگرت (ئەویش) لێی گیرا کرد بەڕاستی هەر ئەو تەوبەگیراکاری میهرەبانە (٣٧) قُلْنَا اهْبِطُوا مِنْهَا جَمِيعًا فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٣٨) ووتمان: هەموو بچنە خوارەوە لە بەهەشت ئەمجا ئەگەر لە منەوە ڕێنمونیەکتان بۆ هات ئەو کەسەی دوای ڕێنموونی من بکەوێت نە ترسیان لەسەرە و نە خەم دەخۆن (٣٨)} [البقرة:٣٥-٣٨].

وکاتێک ئادەم -علیە السلام- تەوبەی کرد ئەوا چیتر گوناهەکە لەسەر نامێنێت، ولە پاشاندا نەوەکانی ئادەم نابن بە میراتگری ئەو گوناهە لە کاتێکدا ئەو گوناهە بەهۆی تەوبەوە خودا لێی خۆش بوو، وبنچینە ئەوەیە کە مرۆڤ تاوانی کەسێکی تر لە ئەستۆ ناگرێت (ئەگەر ئەو هۆکار نەبوو بێت بۆ ئەوەی کەسێکی تر

تاوانێکی دیاریکراو ئەنجامبدات)، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ} واتە: {و هەرکەسێک هەر تاوانە وخراپە وگوناهێک بکات تەنها لەسەر خۆیەتی وهیچ کەسێکی گوناهکار گوناهی کەسێکی تر هەڵناگرێت پاشان گەڕانەوەتان هەر بۆ لای پەروەردگارتانە ئەمجا هەواڵتان پێدەدا بەوەی کە ئێوە تێیدا جیاواز بوون} [الأنعام:١٦٤]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {مَّنِ اهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا} واتە: {هەرکەس ڕێنمونی و هیدایەتی وەرگرتبێت ئەوا بێگومان ڕێنمونی و هیدایەتەکەی (سوود و قازانجەکەی) هەر بۆ خۆی دەبێت و هەرکەسیش گومڕا بووبێت ئەوا بێگومان (زیان و سزاکەی) هەر بۆ خۆی دەبێت وهیچ کەسێکی گوناهکار گوناهی هیچ کەسێکی تر هەڵناگرێت ئێمە هەرگیز سزای (بەندەکان) نادەین هەتا پێغەمبەر نەنێرین (بۆیان)} [الإسراء:١٥]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۗ إِنَّمَا تُنذِرُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِالْغَيْبِ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ ۚ وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِ ۚ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ } واتە: {هیچ گوناهبارێك گوناهی کەسێکی تر هەڵناگرێت وئەگەر بارگرانی (گوناهبارێك) بانگی کەسێکی تر بکات بۆ هەڵگرتنی (بارە گوناهەکەی) هیچ لەو (بارە گوناهە) هەڵناگرێت هەرچەندە (داوا لێکراوەکە) خزمیشی بێت بەڕاستی تۆ (ئەی موحەممەد -صلی الله علیه وسلم-) تەنها ئەوانە بێدار دەکەیتەوە کە بە پەنهانی لەپەروەردگاریان دەترسن ونوێژەکانیان بە ڕێکی جێبەجێ دەکەن و هەرکەسێک خۆی پاک ڕابکرێت (لە تاوان) ئەوا بەڕاستی (سوودی) خۆ پاك ڕاگرتنەکەی هەر بۆ خۆیەتی وگەڕانەوەش تەنها بۆ لای خودایە} [فاطر:١٨].

## ١٦. ومەبەست وئامانج لە دروستکردنی خەڵکی: بۆ پەرستنی خودایە بە تەنها بە بێ بڕیاردانی هیچ شەریک وهاوبەشێک.

ومەبەست وئامانج لە دروستکردنی بوونەوەرەکان بریتیە لە: پەرستنی خودا -الله- بە تەنها وبە بێ بڕیاردانی هیچ شەریک وهاوبەشێک لە پەرستنیدا، خوای گەورە دەفەرموێت: { وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ} واتە: {ومن جنۆکە وئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە دروست کردووە کە بەندایەتی من بکەن -من بپەرستن-} [فاطر:١٨].

## ١٧. ئاینی ئیسلام ڕێزی لە مرۆڤ گرتووە (بە پیاوان وئافرەتانەوە)، وهەموو مافێکی بە مرۆڤ داوە وکردوویەتی بە بەرپرسیار لەسەر بژاردەکانی وکردەوەکانی وهەڵسوکەوتەکانی ولێپرسینەوە وبەپرسیاریەتی خستووەتە ئەستۆ سەبارەت بە هەرکردەوەیەک کە زیان لە خۆی یان بە خەڵکی بگەیەنێت.

ئاینی ئیسلام ڕێزی لە مرۆڤ گرتووە -پیاو یان ئافرەت بێت-، خوای گەورە مرۆڤی دروست وخەڵق کردووە بۆ ئەوەی ببێت بە جێنشین لەسەر زەویدا، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً } واتە: {(بیریان بێنەرەوە) کاتێک کە پەروەردگاری تۆ بە فریشتەکانی ووت: بەڕاستی من جێنشینێک دروست دەکەم لەسەر زەوی } [البقرة:٣٠]. ئەم ڕێزلێنانە هەموو نەوەی ئادەمێک -هەموو مرۆڤێک- دەگرێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: { وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا } واتە: {سوێند بە خوا بێگومان ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرت ولە ووشکانی

وله دەریادا هەڵمان گرتن (بە سواری وبۆ سـەفەر کـردن) و ڕۆزی پـاک وخـاوێنمان پێداون وفەزڵمان داون بەسەر زۆرێک لەوانەی کە دروستمان کردوون بە فەزڵێکـی گەورە} [الإسراء:٧٠]. وخـوای گەورە دەفەرموێـت: {لَقَـدْ خَلَقْنَـا الْإِنسَـانَ فِي أَحْسَـنِ تَقْوِيمٍ } واتە: {سوێند بە خودا بەڕاستی مـرۆڤمان لە جـوانترین شـێوەدا دروسـتکرد} [التـين:٤]. وخـــوای گەورە نەهـــی لە مـــرۆڤ کـــردووە کە خـــۆی بکـــات بە شوێنکەوتوویەکی زەلیل وسەرشۆڕ بۆ پەرسـتراوێک یـان یەکێـک خەڵکـی شـوێنی بکەوێت یان یەکێک کە گـوێڕایەڵی بکرێـت جـگە لە خـوای گەورە، خـوای گەورە دەفەرموێت: {وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُـبِّ اللَّهِ ۖ وَالَّـذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِّـلَّهِ ۗ وَلَوْ يَرَى الَّذِينَ ظَلَمُوا إِذْ يَرَوْنَ الْعَذَابَ أَنَّ الْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعَذَابِ. إِذ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُـواْ مِـنَ ٱلَّـذِينَ ٱتَّبَعُـواْ وَرَأَوُاْ ٱلعَـذَابَ وَتَقَطَّعَـت بِهِـمُ ٱلأَسبَابُ} واتە: {وکەسانی وا هەیە لە خەڵکی کە هاوبەشی زۆر بۆ خودا پەیدا دەکەن خۆشیان دەوێن وەک خۆشەویستی ئیمانداران بۆ خودا، بەڵام ئەوانەی بڕوایان هێناوە زۆر زیاتر خوایان خۆش دەوێت ئەگەر ببینن ئەوانەی ستەمیان کـردوە (بە هـاوبەش پەیدا کردن بۆ خودا) کاتێک کە چاویان دەکەوێت بە سزای خودا دەزانن کە هەرچی دەسەڵات هەیە هەمووی بۆ خودایە وبێگومان سزای خودا زۆر سەختە} [البقرة: ١٦٥ ١٦٦]. وخوای گەورە حاڵی شـوێنکەوتووان وئەوانەی خەڵکـی شـوێنیان دەکەن (کە لەسەر شتی پوچ وبەتاڵن) بە بەتاڵ وپـوچەڵ ودۆڕاو باسـدەکات لە ڕۆژی قیامەتـدا، ودەفەرموێت: { قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا لِلَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا أَنَحْنُ صَـدَدْنَاكُمْ عَـنِ الْهُـدَىٰ بَعْـدَ إِذْ جَـاءَكُم ۖ بَـلْ كُنـتُم مُّجْـرِمِينَ (٣٢) خۆبەگەورەزانەکـان دەڵـێن بە ئەوانەی ژێردەستە ولاواز کرابوون ئایا ئێمە ڕێگریمان کـردن لە ڕێنمـونی دوای ئەوەی بۆتـان هات (نەخێر وا نییە) بەڵکو خۆتان تاوانبار بوون (٣٢) وَقَالَ الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا لِلَّـذِينَ اسْتَكْبَرُوا بَلْ مَكْرُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَا أَن نَّكْفُرَ بِاللَّهِ وَنَجْعَـلَ لَـهُ أَنـدَادًا ۚ وَأَسَرُّوا

النَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ وَجَعَلْنَا الْأَغْلَالَ فِي أَعْنَاقِ الَّذِينَ كَفَرُوا هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (٣٣) ژێر دەستەو چەوساوەكان دەڵێن بەوانەی خۆبەگەورەزان بوون (نەخێر وا نییە) بەڵكو پیلانی (ئێوە) بە شەو وبە ڕۆژ (چەواشەی كردین) كاتێك فەرمانتان پێ دەكردین بۆ ئەوەی بێ باوەڕ بین بە خودا وهاوبەش وشەریكی بۆ دابنێین هەموویان پەشیمانی دەشارنەوە كاتێك كە سزای دۆزەخ دەبینن وزنجیر وتەوقمان كردە گەردنی بێباوەڕان ئایا تۆڵەیان لێ دەسێندرێت جگە لە سزای ئەوەی دەیانكرد (٣٣)} [سبأ:٣٢ – ٣٣].

ولە نیشانەكانی دادپەروەری خودا -سبحانە وتعالی- ئەوەیە كە بانگخواز وپێشەوا گومڕاكەرەكان تاوانی خۆیان هەڵدەگرن وتاوانی ئەوانەش هەڵدەگرن كە گومڕایان كردوون بە نەزانینەوە لە ڕۆژی قیامەتدا، خوای گەورە دەفەرموێت: {لِيَحْمِلُوا أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ} واتە: {بۆ ئەوەی باری گوناهی خۆیان بە تەواوی هەڵبگرن لە ڕۆژی دوایدا لەگەڵ هەندێک لە باری گوناهی ئەوانەی كە ئەمان گومڕایان دەكردن بەبێ زانیاری بێداربن زۆر بەدە ئەوەی كە هەڵیدەگرن (ولە ئەستۆی دەگرن)} [النحل:٢٥]. وئاینی ئیسلام هەموو مافێكی بەخشیووە بە مرۆڤەكان وبۆیانی زامن كردووە لە دونیا وقیامەتدا، ولە مەزنترین مافەكان كە ئاینی ئیسلام بەخشیوویەتی وزامنی كردووە بریتیە لە: مافی خودا لە سەر بەندەكان، ومافی بەندەكان لەسەر خودا ، فعَنْ مُعَاذٍ رضي الله عنه قَالَ: أَنَا رَدِيفُ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: «يَا مُعَاذُ» قُلْتُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ ثُمَّ قَالَ مِثْلَهُ ثَلَاثًا: «هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ اللَّهِ عَلَى العِبَادِ» قُلْتُ: لاَ قَالَ: «حَقُّ اللَّهِ عَلَى العِبَادِ أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلاَ يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا» ثُمَّ سَارَ سَاعَةً فَقَالَ: «يَا مُعَاذُ» قُلْتُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ قَالَ: "هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ العِبَادِ عَلَى اللَّهِ إِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ: أَنْ لاَ يُعَذِّبَهُمْ » واتە: «لە موعازەوە -ڕەزای خوای لێبێت- دەڵێت: لە پشتی پێغەمبەرەوە بووم -صلى

الله عليه وسلم- له سەر پشتی ئاژەڵێک بوون، پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- فەرمووی: «ئەی موعاز»، ئەویش ووتی: «من لێرەم لە خزمەتتدام ئەی پێغەمبەری خودا»، سێجار هەردوو لا ئەم قسانەیان دووبارە کردەوە وپاشان پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- فەرمووی: «ئایا دەزانی مافی خودا لەسەر بەندەکان چییە؟»، ئەویش (موعاز) ووتی: «نەخێر»، -صلى الله عليه وسلم- فەرمووی: «مافی خودا لەسەر بەندەکان ئەوەیە کە بیپەرستن وهیچ هاوەڵ وشەریکێکی بۆ بڕیار نەدەن لە پەرستنیدا»، پاش ماوەیەک فەرمووی: «ئەی موعاز»، ووتم:«من لێرەم لە خزمەتتدام ئەی پێغەمبەری خودا»، فەرمووی: «ئایا دەزانی مافی بەندەکان لەسەر خودا ئەوەیە ئەگەر ئەوەیان ئەنجامدا (ئەگەر خودا بپەرستن بە بڕیاردانی هیچ شەریک وهاوبەشێک): سزایان نەدات».[صحيح البخاري: ٦٨٤٠]. وئاینی ئیسلام پاراستنی ئاینی هەق ونەوە وسامان ونەفس وناوبانگی (شەرەفی) مرۆڤی زامن کردووە، -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «فَإِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَيْكُمْ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا فِي شَهْرِكُمْ هَذَا فِي بَلَدِكُمْ هَذَا» واتە: «خودا خوێنتان وماڵتان (سامانتان) وناوبانگتانی (شەرەف ونامووستانی) لەسەر یەکتر حەرامکردووە وەکو حەرامی ئەم ڕۆژە وئەم مانگە وئەم شارەتان». [صحيح البخاري: ٦٥٠١]، وپێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- ئەم پەیمانە مەزنەی ئاشکرا کرد لە حەجی ماڵئاواییدا کە زیاتر لە سەد هەزار لە هاوەڵان ئامادەی بوون وئەم واتایانەی دووبارە کردەوە ودووپاتی لەسەر کردەوە لە ڕۆژی قوربانیدا لە حەجی ماڵئاوایی. وئاینی ئیسلام مرۆڤی کردووە بە بەرپرسیار بەرامبەر هەموو هەڵبژاردەکانی وکردەوەکانی وهەڵسوکەوتەکانی، خوای گەورە دەفەرموێت: { وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَابًا يَلْقَاهُ مَنشُورًا اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا } واتە: { وهەموو مرۆڤێک (لە ڕۆژی دواییدا) کردەوەی خۆیمان کردووەتە

گەردنیەوە (چاکە یان خراپە بێت) ولە ڕۆژی دواییدا بۆی دەردەهێنن نامەیەک کە بە کراوەیی (وهەموو کردەوەکانی تێدا نووسراوە) ودەیبینێت } [الإسراء:١٣]. هەرکردەوەیەک خێر یان شەڕ بێت خوای گەورە وایلێدەکات بە گەردنی خودی کەسەکەوە بێت، بۆیە هیچ کەسێک لێپرسینەوەی لێناکرێت سەبارەت بە کردەوەی یەکێکی تر، ویەکێکی تر لێپرسینەوەی لێناکرێت سەبارەت بە کردەوەی کەسی یەکەم، خوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَاقِيهِ} واتە: {ئەی ئینسان تۆ بێگومان تێکۆشەریت بەرەو پەروەردگارت بەتێکۆشان (بە ئەنجامدانی چاکە وخراپە) ! ئەوسا پێی دەگەیت} [الانشقاق:٦]. وهەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: { مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ وَمَنْ أَسَاءَ فَعَلَيْهَا وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ} واتە: {هەر کەسێك کاری چاکە بکات (قازانجەکەی) بۆ خۆیەتی هەر کەسیش خراپە بکات (زیانەکەی) بۆ خۆیەتی وپەروەردگارت ستەم لە بەندەکانی ناکات} [فصلت:٤٦]. وئاینی ئیسلام بەرپرسیاریەتی دەخاتە ئەستۆی مرۆڤ ئەگەر هەرکردەوەیەک ئەنجامبدات کە ببێتە هۆی زیانگەیاندن بە نەفسی خۆی یان زیانگەیاندن بە خەڵکانی تر، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَمَن يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُ عَلَىٰ نَفْسِهِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا} واتە: {وهەرکەسێک گوناهێکی (گەورە) بکات بێگومان (زیانی) ئەو گوناهە هەر بۆ خۆیەتی وخودا هەمیشە زانای کاردروستە} [النساء:١١١]. وخوای گەورە دەفەرموێت: { مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا } واتە: { هەر لەبەر ئەوەی (کە لەو داستانەدا باسکرا) پێویستمان کرد لەسەر نەوەی ئیسرائیل کە بێگومان بڕیار ئەمەیە ئەوەی تەنها کەسێک بکوژێت (بە مەرجێک لە تۆڵەی کەسێکی کوژراودا نەبێت یان تۆڵەی خراپە کاری وئاژاوە نانەوە نەبێت لەسەر زەویدا) ئەوە وەک ئەوە وایە هەموو

خەڵکی کوشتبێت } [المائدة:٣٢]. وپێغەمبەری خودا -صلی الله علیه وسلم- دەفەرموێت: «لَا تُقْتَلُ نَفْسٌ ظُلْمًا إِلَّا كَانَ عَلَى ابْنِ آدَمَ الْأَوَّلِ كِفْلٌ مِنْ دَمِهَا لِأَنَّهُ كَانَ أَوَّلَ مَنْ سَنَّ الْقَتْلَ» واتە: «هەر نەفسێک بە ستەملێکراوی کوژرا بێت؛ ئەوا بەشێک لە خوێنەکەی لە سەر یەکێک لە کوڕەکانی ئادەمە، چونکە ئەو یەکەم کەس بوو کە تاوانی کوشتنی هێنایە ئاراوە». [صحیح مسلم: ٥١٥٠].

## ١٨. ولە ئاینی ئیسلامدا ئافرەت وپیاو یەکسانن لە ڕوانگەی بەرپرسیاریەتی وپاداشت وسزادان.

ولە ئاینی ئیسلامدا ئافرەت وپیاو یەکسانن لە ڕوانگەی کردەوە ئەنجامدان وبەرپرسیاریەتی وپاداشت وسزادان، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَٰئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا} واتە: {کەسێکیش کردەوە چاکەکان جێبەجێ دەکات لە نێر یان لە مێ لە هەمان کاتدا ئەو کەسە بڕوادار بێت ئەوە ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە وبچووکترین ستەمیان لێناکرێت (ئەگەر هێندەی توێکڵی ناوکە خورمایەکیش بێت)} [النساء :١٢٤]. وخوای گەورە دەفەرموێت: { مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ } واتە: {هەرکەسێک لە نێر یان لە مێ کردەوەی چاکی کردبێت وبیکات وبڕواداریش بووبێت ئەوە سوێند بە خودا بە ژیانێکی خۆشیان پێدەبەخشین و سوێند بێت پاداشتیان بدەینەوە بە چاکتر لەوەی کە ئەوان ئەنجامیاندەدا}[النحل:٩٧]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَىٰ إِلَّا مِثْلَهَا وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَٰئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ} واتە: {هەر کەسێك کاری خراپەی کرد بێت

هەر بەئەندازەی خراپەکەی سزا دەدرێت هەر کەسیش چاکەی کرد بێت ئافرەت بێت یان پیاو (بەو مەرجەی) باوەڕدار بێت ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە لەوێدا بەبێ ژمـارە وحیساب ڕزق و ڕۆزییان پێ دەدرێت} [غافر:٤٠].

وخوای گەورە دەفەرموێت: {إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَـاتِ وَالْقَـانِتِينَ وَالْقَانِتَـاتِ وَالصَّـادِقِينَ وَالصَّـادِقَاتِ وَالصَّـابِرِينَ وَالصَّـابِرَاتِ وَالْخَاشِـعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّـائِمَاتِ وَالْحَـافِظِينَ فُـرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِـيمًا} واتە: {بەڕاستی پیاوە موسڵمانەکان وئـافرەتە موسـڵمانەکان وپیـاوە باوەڕدارەکـان وئـافرەتە باوەڕدارەکـان وپیـاوانی هەمیشـە گـوێڕایەڵ وئافرەتـانی هەمیشـە گـوێڕایەڵ وپیـاوە ڕاستگۆکان وئافرەتە ڕاستگۆکان و پیـاوان وئافرەتـانی خـۆگر وبە ئـارام وپیـاوانی لە خودا ترس وژنانی لە خودا ترس و پیاوان وئافرەتـانی بەخشـندە و پیـاوان وئافرەتـانی ڕۆژووگـر، پیـاوان وئافرەتـانی داوێـن پـاك، وپیاوانێـک کە زۆر یـادی خـوا دەکەن وئافرەتانێـک کە زۆر یـادی خـوا دەکەن خـودا ئامـادەی کـردووە بـۆ هەموویـان لێخۆشبوون وپاداشتی گەورە} [الأحزاب:٣٥].

**١٩. ئاینی ئیسلام ڕێزی لە ئافرەت گرتووە وئافرەتانی بە هاوتای پیاوان داناوە (مەگەر لە هەندێک حوکمی شەریعەت وئەو شتانە نەبێت کە پەیوەندی بە سروشتی پیاو وئافرەتەوە هەیە)؛ واجبی کردووە لەسەر پیاو کە خەرجی بکات ئەگەر لە توانایدا هەبوو، بۆیە باوک واجبە خەرجی بکات لەسەر کچەکانی، وکوڕەکان لەسەر دایک وخوشکیان ئەگەر باڵغ بوون وتوانایان هەبوو، وئافرەت لەسەر مێردەکەی.**

پێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «إن النساء شقائق الرجال» واتە: «ئافرەتان هاوتای پیاوانن (مەگەر لە هەندێک حوکمی شەریعەت وئەو شتانە نەبێت کە پەیوەندی بە سروشتی پیاو وئافرەتەوە هەیە)». [رواه الترمذي: ١١٣].

ولە ڕێزلێنانی ئاینی ئیسلام بۆ ئافرەت ئەوەیە کە واجبە لەسەر کوڕ کە پێداویستیەکانی دایک دابین بکات وبۆی جێبەجێ بکات ئەگەر لە توانایدا هەبوو. پێغەمبەری -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «يَدُ الْمُعْطِي الْعُلْيَا -وابدأ بمن تعولُ:- أُمَّكَ وَأَبَاكَ وَأُخْتَكَ وَأَخَاكَ ثُمَّ أَدْنَاكَ أَدْنَاكَ» واتە: «ئەو دەستەی دەبەخشێت بەزرترە -سەرەتا ببەخشە بە ئەوانەی کە خەرجیان لەسەرت واجبە- دایکت وباوکت وخوشکت وبرات وپاشان کەسەکانی ترت بە پێی نزیکیان» [رواه: أحمد و النسائي].

باسی پلەوپایەی دایک وباوک دەکرێت بە ئیزنی خودا لە بڕگەی ژمارە (٢٩).

ولە ڕێزلێنانی ئاینی ئیسلام بۆ ئافرەت ئەوەیە کە واجبە لەسەر مێردەکەی پێداویستیەکانی بۆ جێبەجێ بکات وخەرجی لەسەر بکات ئەگەر لە توانایدا هەبوو، خوای گەورە دەفەرموێت: { لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِ ۖ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ ۚ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَا آتَاهَا ۚ سَيَجْعَلُ اللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا} واتە: {با دەوڵەمەند بە پێی دەوڵەمەندیی خەرجی بکات وهەر کەسێك کەم دەست وهەژار

بوو با بە پێی ئەوەی کە خوا پێی بەخشیووە خەرجی بکات، خوا داوا لەکەس ناکات مەگەر بە پێی ئەوە نەبێت کە پێی بەخیشووە (لە توانا) بێگومان خوا دوای تەنگانە ئاسانی دەهێنێت} [الطلاق:٧]. پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەر -صلى اللە علیە وسلم- کرد: ئایا مافی خێزانی یەکێک لەسەر مێردەکەی چییە؟ ئەویش -صلى اللە علیە وسلم- فەرمووی: «تُطْعِمُهَا إِذَا طَعِمْتَ وَتَكْسُوهَا إِذَا اكْتَسَيْتَ وَلَا تَضْرِبِ الْوَجْهَ وَلَا تُقَبِّحْ» واتە: «خۆراکی پێببەخشیت ئەگەر خۆت خۆراکت خوارد، وجلی پێببەخشیت ئەگەر خۆت جلت لەبەرکرد، وبە لێدان لە دەموچاوی نەدەیت، وجوێنی پێنەدەیت». [رواه أحمد]. وپێغەمبەر -صلى الله علیه وسلم- هەندێک لە مافەکانی ئافرەتانی لەسەر مێردەکانیان ڕوونکردەوە: «وَلَهُنَّ عَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ» واتە: «ئەرکی ئەوان لەسەر ئێوە ئەوەیە کە ڕزق (خۆراک) وجلیان پێببەخشن بە پێی پێویست ودادپەروەری». [صحیح مسلم]. و -صلى اللّٰه علیه وسلم- دەفەرموێت: «كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يُضَيِّعَ مَنْ يَقُوتُ» واتە: «ئەوەندە تاوانبار بێت بەسە بۆ کەسێک کە خۆی بگرێتەوە لە خەرجکردن وبەخشین بە ئەوانەی کە واجبە لەسەری خۆراک وپێداویستیان بۆ دابین بکات». [رواه: أحمد و النسائي]. وخەتابی -ڕەحمەتی خوای لێبێت- دەڵێت: (کاتێک دەفەرموێت: -من یقوت: واتە: ئەوانەی واجبە لەسەری خۆراک وپێداویستیان بۆ دابین بکات-، وبە شێوەیەکی تر مانای ئەوەیە کە بەو کەسەی خێر دەکات دەفەرموێت: خێرێک مەکە کە هیچ فەزڵ وپاداشتێکی تێدا نەبێت چونکە نابەخشیت بە خێزانەکەت؛ لەوەیە بەم خێرکردنە گوناهبار ببیت، چونکە تۆ هیچ شتێک نابەخشیت بە خێزانەکەت بەڵام خێر دەکەیت! ).

ولە ڕێزلێنانی ئاینی ئیسلام بۆ ئافرەت ئەوەیە کە خەرجی ودابینکردنی پێداویستیەکان ئافرەت لەسەر باوکیەتی (پێش ئەوەی هاوسەرگیری بکات)، واتا

ئەگەر ئافرەتەکە سەرپەرشتیاری (وەلی ئەمری) هەبێت واجبە لەسەر پێداویستی وخەرجییەکانی ئەو ئافرەتە دابین بکات جا چ برای یان باوکی یان مێردی بێت، واجب نییە لەسەر ئافرەتەکە کە خۆی هەوڵبدات بۆ دابینکردنی بژێوی وپێداویستیەکانی ژیانی کە ئەمیش زۆر سوودی تری هەیە بۆ کۆمەڵگا، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ} واتە: {دایکان شیر بدەن بە منداڵەکانیان دوو ساڵی تەواو (ئەمە) بۆ کەسێکە کە بیەوێت شیری تەواو بدات لەسەر باوکەکەیە بە باشی ڕۆزی وکاڵا وپێداویستی دایکەکان دابین بکات} [البقرة:٢٣٣]. خوای گەورە ئەوەی ڕوونکردووەتەوە کە لەسەر باوک واجب وئەرکە کاتێک منداڵی دەبێت پێویستە خۆراک وجلی بۆ دابین بکات بە پێی پێویست ودادپەروەری، خوای گەورە دەفەرموێت: {فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ} واتە: {ئەگەر ئەو ژنە تەڵاقدراوانە شیریان بە منداڵەکانتان داو گۆشیانکردن، ئەوا هەق وماف وکرێی خۆیانیان پێبدەن، واتە: ئەگەر ژنە تەڵاق دراوەکە داوای کرێی کرد، دەبێت پیاوەکە کرێی شیرپێدانەکەی پێبدات} [الطلاق:٦]. بۆیە خوای گەورە واجبی کردووە کە باوک کرێی شیرپێدانی منداڵ بدات، وئەمیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەیە کە خەرجی وپێداویستیەکانی منداڵ لەسەر دایک وباوک واجبە، وئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خەرجی ودابینکردنی پێداویستیەکانی دایک ومنداڵەکانیان واجبە لەسەر باوک: لە عائیشەوە -ڕەزای خوای لێبێت- دەڵێت: هند بە پێغەمبەری ووت -صلى الله عليه وسلم-: ئەبو سوفیان پیاوێکی ڕەزیلە پێویستمە لە پارە وسامانەکەی دەربکەم، پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- پێی فەرموو: «خُذِي مَا يَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ» واتە: «ئەوەندە دەربهێنە کە خۆت ومنداڵەکەت پێویستتانە بە دادپەروەرییەوە». [رواه البخاري]. وپێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم-

فەزڵ وپاداشتی خەرجی ودابینکردنی پێداویستیەکانی کچ وخوشک وخێزانی ڕوونکردووتەوە، کە دەفەرموێت: «مَنْ عَالَ ابْنَتَيْنِ أَوْ ثَلَاثَ بَنَاتٍ أَوْ أُخْتَيْنِ أَوْ ثَلَاثَ أَخَوَاتٍ حَتَّى يَبِنَّ أَوْ يَمُوتَ عَنْهُنَّ كُنْتُ أَنَا وَهُوَ كَهَاتَيْنِ. وَأَشَارَ بِأُصْبُعَيْهِ السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى» واتە: «هەرکەسێک (دوو کچ یان سیان، دوو خوشک یان سیان) بەخێو بکات (پەروەردەیان بکات وپێداویستەکانیان دابین بکات)؛ هەتا ئەوان لێی جیا دەبنەوە (بە هاوسەرگیری کردنیان یان مردنیان) یان خۆی بمرێت؛ ئەوا من وئەو کەسە (بەخێوکارە) وەکو ئەم دووانە دەبین (لە بەهەشتدا). وئاماژەی بۆ پەنجەی شایەتمان وپەنجەی ناوەڕاست کرد». [السلسلة الصحيحة: ٢٩٦].

## ٢٠. مردن نەمان وتیاچوون نییە بۆ هەتاهەتایە، بەڵکو دەرچوونە لە شوێنی کردەوە ئەنجامدان بۆ شوێنی پاداشت وەرگرتن بە چاکە وخراپە، ومردن لاشە وڕۆح دەگرێتەوە، ومردنی ڕۆح ئەو کاتەیە کە لە لاشە جیا دەبێتەوە وپاشان بۆ دەگەڕێتەوە لە پاش زیندووبوونەوە لە ڕۆژی قیامەتدا، ولە پاش مردن ڕۆح ناچێت بۆ نێو لاشەیەکی تر ودووبارە ژیانی نوێ ناژێت لە نێو لاشەی مرۆڤێکی تردا.

خوای گەورە دەفەرموێت: {قُلْ يَتَوَفَّاكُم مَّلَكُ الْمَوْتِ الَّذِي وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ} واتە: {(ئەی موحەممەد -صلى الله عليه وسلم-) بڵێ فریشتەی گیان کێشان کە گیان کێشانی ئێوەی پێسپێردراوە دەتان مرێنێت لە پاشان بۆ لای پەروەردگارتان دەگەڕێندرێنەوە} [السجدة:١١]. مردن؛ لاشە وڕۆح دەگرێتەوە، ولاشە دەمرێت کاتێک ڕۆح لێی جیا دەبێتەوە، وپاشان بۆ ناو لاشەکە دەگەڕێتەوە کاتێک خوای گەورە مردووەکان زیندوو دەکاتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا، هەروەکو خوای گەورە

دەفەرموێت: { اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا  فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَىٰ عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الْأُخْرَىٰ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى  إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ} واتە: {خـودا گیانەکـان دەکێشـێت لەکـاتی مردنیانـدا وئەوەی نەمردبێـت لەکـاتی خەوتنیدا، ئەمجا ئەو (گیانانە) ڕادەگرێت بڕیاری مردنی داوە وئەوانی تـر ڕاناگرێـت (چونکە دەبێ زیندوو بن) تا ماوەیەکی دیـاریکراو، بەڕاسـتی لەمەدا چەنـد بەڵـگە هەیە بۆ ئەو کەسانەی بیردەکەنەوە} [الزمر:٤٢]. وپێغەمبەری خودا -صلی الله علیـه وسلم- دەفەرموێت: «إِنَّ الرُّوحَ إِذَا قُبِضَ تَبِعَهُ الْبَصَرُ» واتە: «ڕۆح کاتێک دەکێشرـێت (لە لاشە دەردەچێت)، چاو سەیری دەکات (کاتێـک بەرەو ئاسـمان دەچێـت)» [رواه مسلم: ٩٢٠]. وپاش مردن مرۆڤ لە ژیانی کردەوە کردن بەرەو ژیانی پاداشتدانەوە (بە چاکە وخراپە) دەچێت، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: { إِلَيْـهِ مَـرْجِعُكُمْ جَمِيعًـا وَعْدَ اللَّهِ حَقًّا  إِنَّهُ يَبْدَأُ الْخَلْـقَ ثُـمَّ يُعِيـدُهُ لِيَجْـزِيَ الَّـذِينَ آمَنُـوا وَعَمِلُـوا الصَّـالِحَاتِ بِالْقِسْطِ  وَالَّذِينَ كَفَرُوا لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَـانُوا يَكْفُـرُونَ } واتە: {گەڕانەوەی هەمووتـان هەر بـۆ لای ئەوە بەڵێنـی خـوا هەق وڕاسـتە بێگومـان خـوا لەسـەرەتاوە دروسـتکراوان دووبـارە دروسـت دەکـاتەوە دوای (مردنیـان) بـۆ ئەوەی پاداشتی ئەوانە بداتەوە کە بڕوایان هێنـاوە وکـردەوەی چاکیـان کـردووە بە دادگەرانە وئەوانەی باوەڕیان نەهێناوە بۆیان هەیە خواردنەوەی کوڵا وکـوڵی زۆر گەرم وسـزای سەختی ئازاردەر لەبەرئەوەی لە دونیادا کافر وبێبـاوەڕ بـوون} [یـونس:٤]. وڕۆح لە پاش مردن ناچێت بۆ نێو لاشەیەکی تر، وبانگەی لاشەگۆڕکێی ڕۆحەکان (استنساخ الأرواح) هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نەهاتووە لە لایەن پێغەمبەرانەوە -علـیهم السـلام- وهەروەها هیچ بەڵگەیەکی ئەقڵی وهەسـتپێکراو ئامـاژە بـۆ ئەم بیروبـاوەڕە پـوچەڵە ناکات.

## ٢١. ئـاینی ئیسـلام بانگەشـە دەكـات بـۆ باوەڕهێنـان بە بنچیـنە مەزنەكانی ئیمان كە بریتیە لە: باوەڕهێنان بە خـودا وفریشـتەكان وكتێـبە ئاسمانییەكان وەكو تەورات وئینجیل وزەبوور -پـێش دەسـتكاری كردنیـان وگۆڕینیان- وبە قورئان، وباوەڕهێنان بە هەموو پێغەمبەران وباوەڕهێنان بۆ كۆتا پێغەمبەر كە موحەممەدە -صلى الله عليه وسلم-، وباوەڕهێنـان ڕۆژی دوایی -قیامەت-، ودەبێت بـزانین كە ئەگەر ژیـانی دونیـا كۆتـایی بـووایە وبیڕایەتەوە وژیانێكی تر نەبووایە ئەوا بوونمان تەنها بۆ گـاڵتە وگەپ وبـێ هۆ بوو، وباوەڕهێنان بە قەزا وقەدەر.

ئاینی ئیسلام بانگەشە دەكـات بە ئـیمان وباوەڕهێنـان بە بنچیـنە مەزنەكـانی ئیمان؛ ئەوانەی كە هەموو پێغەمبەران بانگەشەیان بۆ كردوون -عليهم السلام-، ئەم بنچینانەش بریتین لە:

یەكەم: باوەڕهێنان بەوەی كە خـودا تەنهـا خـودا پەروەردگـارە وخـوڵقێنەرە وڕۆزیـدەرە وئەو گەردوونە ئەم بەڕێـوەی دەبـات وتەنهـا ئەو شـایەنی پەرسـتنە، وپەرستنی جگە لە (الله) پوچەڵ وبەتاڵە؛ بۆیە تەنها ئەو زاتە مەزنە شایەنی پەرستنە بە بێ بڕیاردانی هیچ شەریك وهاوبەشێك لە پەرستنیدا، پەرستن دروسـت نیـیە بە دوو مەرج نەبێت: دەبێت بە دڵسۆزییەوە تەنها بۆ ئەو زاتە مەزنە ئەنجامبـدرێت وبە گوێرەی سونەتی پێغەمبەر -صلى الـله علـيه وسـلم- بێـت، وپێشـتر بەڵگەكـانی ئەم بابەتە ڕوونكراوەتەوە لە بـڕگەی ژمـارە (٨)دا. وخـوای گەورە -سـبحانه وتعـالى- ئەم بنچینە مەزنانەی لە زۆر ئایەتی قورئانی پیرۆزدا باسكردووە، لەوانە كە دەفەرموێـت: { آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ ۚ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ } واتە:

{ (پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم-) بڕوای هێنا بەو پەیـامەی کە بـۆی نێـردراوە لە پەروەردگاریەوە لەگەڵ بڕواداران هەموو بڕوایان هێناوە بە خودا وبە فریشتەکانی وبە پەیامەکانی وبە پێغەمبەرانی جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ یەکێـک لە پەیـامبەران (بڕواداران) ووتیـان: (پێغەمـبەر ئـاینی خـودای پـێ گەیانـدین) ئـێمەش بیسـتمان فەرمانبەرداریمان کرد داوای لێخۆشبوونت لێدەکەین ئەی پەروەردگارمـان وهەر بـۆ لای تۆیە گەڕانەوەمان } [البقـرة:٢٨٥]. وخـوای گەورە دەفەرموێـت: {لَّـيْسَ الْـبِرَّ أَن تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّـائِلِينَ وَفِي الرِّقَـابِ وَأَقَـامَ الصَّـلَاةَ وَآتَى الزَّكَـاةَ وَالْمُوفُـونَ بِعَهْـدِهِمْ إِذَا عَاهَـدُوا وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِـينَ الْبَـأْسِ أُولَٰئِـكَ الَّـذِينَ صَـدَقُوا وَأُولَٰئِـكَ هُـمُ الْمُتَّقُونَ} واتە: {چـاکە ئەوە نیـیە کە ڕوو بـکەنە بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئـاوا بەڵکـو چـاکە ئەوەیە کە مـرۆڤ بـڕوای بە خـوا و بە ڕۆژی دوایـی و بە فریشـتەکان و بە کتێبەکـان و بە پێغەمـبەران ببێـت وسـامانی خـۆی ببەخشـێت لەگەڵ ئەوەی کە -سامانەکەیشی- خۆش دەوێت بە خزمان و بە هەتیوان و بە بێنەوایـان (هەژاران) و بە ڕێبوارانی کەم دەست و بە سواڵکەران و لەڕێـی ئـازاد کردنـی کۆیلەکانـدا و نـوێژی بەچاکی ئەنجامدابێت و زەکاتی دابێت و لە پەیمان بەجێ گەیەنەران بێــت کاتێـک کە پەیمانیان دابێت و خۆڕاگران لەکاتی تەنگدەستی و نەخۆشی و لەکاتی جەنگـدا ئا ئەوانەن کە ڕاستیان کـرد و هەرئەوانەن پارێزکـاران (تەقـواداران)} [البقـرة:١٧٧]. وخـوای گەورە بـانگەوازی دەکـات بـۆ باوەڕهێنـان بە ئەم بنچینـانە وئەوەی کـوفر وبێباوەڕ بێت پێیـان ئەوا گـومڕا بـووە گومڕابـوونێکی ڕوون وئاشـکرا، خـوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَـزَّلَ عَـلَىٰ رَسُـولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنزَلَ مِن قَبْلُ وَمَن يَكْفُرْ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَـوْمِ الْآخِـرِ

فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا} واته:{ئەی کەسانێک کە باوەڕتان هێناوە بەردەوام بـن لەسـەر باوەڕ بەخوا و پێغەمبەرەکەی و بەو قورئانەی ناردوویەتیە خوارەوە بۆ پێغەمـبەرەکەی و بەو کتێبانەش کە پێشتر ناردوویەتیە خوارەوە, و هەر کەسێک بـێ بـاوەڕ بێـت بە خوا و بە فریشـتەکانی و بە کتێبەکـانی و بە پێغەمبەرەکـانی و بە ڕۆژی دوایـی ئەوا بەڕاسـتی گـومڕا بـووە بە گـومڕاییەکی زۆر دوور (لەڕاسـتی)} [النسـاء:١٣٦]. ولە فەرمـوودەیەک کە عـومەری کـوڕی خەتـاب -ڕەزای خـوای لێبێـت- دەیگێـڕێتەوە، دەڵێت: «بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ يَوْمٍ إِذْ طَلَعَ عَلَيْنَا رَجُلٌ شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ شَدِيدُ سَوَادِ الشَّعَرِ لَا يُرَى عَلَيْهِ أَثَرُ السَّـفَرِ وَلَا يَعْرِفُـهُ مِنَّـا أَحَـدٌ حَتَّى جَلَسَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَسْنَدَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى رُكْبَتَيْـهِ وَوَضَـعَ كَفَّيْـهِ عَلَى فَخِذَيْهِ وَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ أَخْبِرْنِي عَنِ الْإِسْلَامِ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «الْإِسْلَامُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ وَتَصُومَ رَمَضَـانَ وَتَحُـجَّ الْبَيْـتَ إِنِ اسْـتَطَعْتَ إِلَيْـهِ سَـبِيلًا» قَـالَ: صَدَقْتَ قَالَ: فَعَجِبْنَا لَهُ يَسْأَلُهُ وَيُصَدِّقُهُ قَالَ: فَـأَخْبِرْنِي عَـنِ الْإِيمَـانِ قَـالَ: «أَنْ تُـؤْمِنَ بِاللهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَـيْرِهِ وَشَرِّهِ» قَـالَ: صَـدَقْتَ قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الْإِحْسَانِ قَالَ: «أَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ». واتە: «کاتێک دانیشتبووین لای پێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسـلم- پیاوێـک دەرکەوت وهـاتە لامـان، جـلەکەی زۆر سـپی وقـژی زۆر ڕەش بـوو وبەوە ناکـات کەسێکی موسافیر بێت وکەسـیش لە ئـێمە نایناسـێت هـات دانیشـت لە بەرامـبەر پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- ودەستەکانی لە سەر قاچەکانی خۆی دانا، و ووتی: ئەی موحەمەد ئیسلام چییە؟ پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- فەرمووی: ئەوەیە کە شاهێدی بدەیت بە (لا إله إلا الله ومحمداً رسول الله)، ونوێژ ئەنجام بدەیت وزەکات بدەیت وڕۆژووی ڕەمەزان بگریـت وحەج بکەیـت بـۆ مـاڵی خـودا ئەگەر توانیـت،

ووتی: ڕاست دەکەیت، پێشەوا عومەر دەڵێت: (سەیر بوو بە لامانەوە، پرسیاری لێدەکرد ودەیووت ڕاست دەکەیت). پاشان پیاوەکە ووتی: هەواڵم پێبدە سەبارەت بە ئیمان؟ -صلى الله عليه وسلم- فەرمووی: ئیمان ئەوەیە باوەڕ بهێنیت بە خودا وفریشتەکانی وکتێبەکانی وپێغەمبەرانی ورۆژی دوایی، وباوەڕت هەبێت بە قەدەر بە خێر وشەڕی، ووتی: ڕاست دەکەیت، هەواڵم پێبدە سەبارەت بە ئیحسان (پلەی چاکەکاری لە پەرستندا)؟ -صلى الله عليه وسلم- فەرمووی: خودا بپەرستیت وەکو ئەوە بێت کە بیبینیت خۆ ئەگەر تۆ ئەو نەبینیت ئەوا ئەو تۆ دەبینێت، ووتی: هەواڵم پێبدە سەبارەت بە کاتی ڕوودانی قیامەت (الساعة)؟ -صلى الله عليه وسلم- فەرمووی: ئەوەی پرسیاری لێکراوە زاناتر نیە لەو کەسەی پرسیار دەکات، ووتی: هەواڵم پێبدە سەبارەت بە نیشانەکانی (نیشانەکانی ڕوودانی قیامەت)؟ -صلى الله عليه وسلم- فەرمووی: (أنْ تلِدَ الأَمَةُ ربَّتَها) واتە: منداڵەکان ببن گەورە وسەردار بە سەر بەخێوکارەکانیانەوە -دایک وباوکیانەوە- ( یان بە واتای ئەوە دێت کە کەنیزەکەکان ئەو منداڵەی کە دەیانبێت دەبن بە پادشا)، وببینیت کە کەسانی پێ پەتی وڕووتی هەژار کە شوانێتی دەکەن بینای بەرز دروست بکەن، پاشان پیاوەکە چوو، وعومەر دەڵێت: بۆ ماوەیەک ماینەوە پاشان پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- فەرمووی: ئەی عومەر دەزانیت ئەوە کێ بوو پرسیاری دەکرد؟ ووتم: خودا وپێغەمبەرەکەی دەزانن، -صلى الله عليه وسلم- فەرمووی: ئەوە جبريل بوو هات بۆ ئەوەی ئاینەکەتان فێر بکات». [صحيح مسلم: ٨]. لەم فەرموودەیەدا جبريل -عليه السلام- هات بۆ لای پێغەمبەر موحەمەد -صلى الله عليه وسلم- وپرسیاری پلەوپایەکانی ئاینی لێیکرد وئەوانیش بریتین لە: ئیسلام وئیمان وئیحسان، وپێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- وەڵامی دایەوە وپاشان بە هاوەڵانی فەرموو ئەوە جبريل بوو هاتبوو بۆ ئەوەی ئاینەکەتان فێر بکات. ئەم ئیسلامە پەیامی خودایە کە

جبریل هێناویەتەتی وپێغەمبەر موحەمەدیش -صلی اللە علیە وسلم- بە خەڵکی ڕاگەیاندووە وهاوەڵانیش -ڕەزای خوایان لێبێت- پاراستوویانە وبە خەڵکیان گەیاندووە.

دووەم: باوەڕهێنان بە فریشتەکان کە ئەوان جیهانێکی نەبینراون -غەیبین- وخوای گەورە لەسەر شێوەیەکی دیاریکراو دروستیانی کردووە وئەرکی مەزنی پێسپاردوون ولە مەزنترین ئەو ئەرکانەش گەیاندنی پەیامەکانی خودایە بۆ پێغەمبەران -علیهم السلام- وبەڕێزترینی فریشتەکان جبریلە -علیە السلام-، وبەڵگەی زۆر هەیە لەسەر دابەزینی جبریل -علیە السلام- بۆ هێنانی وەحی بۆ پێغەمبەر -صلی اللە علیە وسلم- لە قورئان وسونەتدا، ولەوانەش خوای گەورە دەفەرموێت: {يُنَزِّلُ الْمَلَائِكَةَ بِالرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ أَنْ أَنذِرُوا أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاتَّقُونِ} واتە: {فریشتە دەنێرێتە خوارەوە بە وەحی بە فەرمانی خۆی بۆ هەر کەسێک لە بەندەکانی کە خۆی بیەوێت بەوەی کە خەڵکی بترسێنن کە بەڕاستی بێجگە لە من هیچ پەرستراوێکی هەقی تر نییە کەواتە هەر لە من بترسن} [النحل:٢]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٩٢) و بەڕاستی ئەم (قورئانە) دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانیانە (١٩٢) نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ (١٩٣) جوبرەیلی ئەمین هێنایە خوارەوە (١٩٣) عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ (١٩٤) بۆ سەر دڵی تۆ بۆ ئەوەی لە ترسێنەران بیت (١٩٤) بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ (١٩٥) بە زمانێکی عەرەبی ڕوون و پاراو (١٩٥) وَإِنَّهُ لَفِي زُبُرِ الْأَوَّلِينَ (١٩٦) و بەڕاستی (باسی قورئان) لە کتێبی پێغەمبەرەکانی پێشوودا هەیە (١٩٦)}[الشعراء:١٩٢-١٩٦].

سێیەم: باوەڕهێنان بە کتێبانەی کە لە لایەن خوداوە دابەزیووە وەکو تەورات وئینجیل وزەبور -پێش ئەوەی دەستکاری بکرێن وبگۆڕدرێن- وقورئان، خوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ

عَلَىٰ رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنزَلَ مِن قَبْلُ وَمَن يَكْفُرْ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا} واته:{ئەی کەسانێک کە باوەڕتان هێناوە بەردەوام بن لەسەر باوەڕ بەخوا و پێغەمبەرەکەی و بەو قورئانەی ناردوویەتیە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەی و بەو کتێبانەش کە پێشتر ناردوویەتیە خوارەوە, و هەر کەسێک بێ باوەڕ بێت بە خوا و بە فریشتەکانی و بە کتێبەکانی و بە پێغەمبەرەکانی و بە ڕۆژی دوایی ئەوا بەڕاستی گومڕا بووە بە گومڕاییەکی زۆر دوور (لەڕاستی)} [النساء:١٣٦]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {نَزَّلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ التَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ (٣) ناردوویەتیە خوارەوە بۆت قورئان بە ڕاستی ودروستی بە ڕاست دانەری هەموو ئەو (کتێبانەیە) لە پێشیدا بوون وتەورات وئینجیلی ناردە خوارەوە (٣) مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ الْفُرْقَانَ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَاللَّهُ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ (٤) لە پێش قورئاندا بە ڕێنمونی بۆ خەڵکی ناردیە خوارەوە وفورقانی دابەزاند (واتە: جیاکەرەوەی ڕاست و ناڕاست؛ مەبەست پێی قورئانە) بێگومان ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون بە ئایەت و بەڵگەکانی خودا سزای سەختیان بۆ هەیە لە قیامەتدا، وخودا شکۆدارە وبە توانایە وخاوەنی تۆڵە وسزایە (٤) } [آل عمران:٣-٤]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلمُؤمِنُونَ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَينَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ وَقَالُواْ سَمِعنَا وَأَطَعنَا غُفرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيكَ ٱلمَصِيرُ} واتە: {پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم- بڕوای هێنا بەو پەیامەی کە بۆی نێردراوە لە پەروەردگاریەوە لەگەڵ بڕوادارانـدا هەموو بڕوایان هێناوە بە خوا وبە فریشتەکانی وبە کتێبەکانی (پەیامەکانی) وبە پێغەمبەرانی جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ یەکێک لە پەیامبەران (بڕواداران) ووتیان: (پێغەمبەر ئاینی خوای پێگەیاندین ئێمەش) بیستمان فەرمانبەرداریمان کرد داوای لێخۆشبوونت لێدەکەین ئەی پەروەردگارمان وهەر بۆ

لای تۆیە گەڕانەوەمان} [البقرة:٢٨٥]. وهەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: {قُل ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَا أُنزِلَ عَلَينَا وَمَا أُنزِلَ عَلَىٰ إِبرَٰهِيمَ وَإِسمَٰعِيلَ وَإِسحَٰقَ وَيَعقُوبَ وَٱلأَسبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِم لَا نُفَرِّقُ بَينَ أَحَدٍ مِّنهُم وَنَحنُ لَهُۥ مُسلِمُونَ} واتە: { (ئەی موحەممەد -صلى الله عليه وسلم-) بڵێ: ئێمە بڕوامان هێناوە بە خوای گەورە, وبەوەی نێردراوەتە خوارەوە بۆمان وبەوەی کە نێردراوەتە خوارەوە بۆ ئیبراهیم وئیسماعیل وئیسحاق یەعقوب وکوڕانی یەعقوب وبەوەی کە دراوە بە موسا وعیسا وەپێغەمبەرەکانی تر لە پەروەردگاریانەوە جیاوازی ناکەین لەنێوان هیچ کامێک لەم پێغەمبەرانە وئێمە بۆ خوای گەورە ملکەچین (گەردن کەچین - گوێڕایەڵین ومسوڵمانین-)} [آل عمران:٨٤].

چوارەم: ئیمان وباوەڕهێنان بە هەموو پێغەمبەرانی خودا -عليهم الصلاة والسلام-، بۆیە واجبە ئیمان هێنان بە هەموو پێغەمبەران ودەبێت مسوڵمان باوەڕی وابێت کە هەموویان نێردراو وپەیامبەرن لە لایەن خوداوە کە پەیام وئاین وشەریعەتی خودا دەگەیەنن بە ئومەتەکان، خوای گەورە دەفەرموێت: {قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِنْ رَبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ}واتە: {(ئەی موسڵمانان) بڵێن: بڕوامان هێنا بە خوا و بە ئەو قورئانەی کە بۆ خۆمان نێردراوەتە خوارەوە، وبەو نامەیەی کە نێردراوە بۆ ئیبراهیم وئیسماعیل وئیسحاق ویەعقوب وکوڕەکانی یەعقوب وبەوەی کە دراوە بە موسا وعیسا وبەوەی کە دراوە بە هەموو پێغەمبەران لە لایەن پەروەدگاریانەوە جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچ کامێکیاندا وئێمە فەرمانبەردار وگوێڕایەڵی خوداین} [البقرة: ١٣٦]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلمُؤمِنُونَ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَينَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ وَقَالُواْ سَمِعنَا وَأَطَعنَا غُفرَانَكَ

رَبَّنَا وَإِلَيكَ ٱلمَصِيرُ} واته: {پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- بڕوای هێنا بەو پەیـامەی کە بۆی نێردراوە لە پەروەردگاریەوە لەگەڵ بڕواداراندا هەموو بڕوایان هێنـاوە بە خـوا وبە فریشتەکانی وبە کتێبەکانی (پەیامەکانی) وبە پێغەمبەرانی جیـاوازی نـاکەین لە نێوان هـیچ یەکێـک لە پەیـامبەران (بـڕواداران) ووتیـان: (پێغەمـبەر ئـاینی خـوای پێگەیاندین ئێمەش) بیستمان فەرمانبەرداریمان کرد داوای لێخۆشبوونت لێـدەکەین ئەی پەروەردگارمان وهەر بۆ لای تۆیە گەڕانەوەمـان} [البقـرة:٢٨٥]. وخـوای گەورە دەفەرمویت: { قُلْ آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْـحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَالنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّـنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ } واتە: { (ئەی موحەممەد -صلى الـله علـيه وسـلم-) بڵـێ: ئـێمە بڕوامـان هێنـاوە بە خـوای گەورە، وبەوەی نێـردراوەتە خـوارەوە بۆمـان وە بەوەی کە نێردراوەتە خوارەوە بۆ ئیبراهیم وئیسـماعیل وئیسـحاق یەعقـوب وکـوڕانی یەعقـوب وبـــەوەی کـــە دراوە بە موســاو عیسـا وپێغەمبەرەکـانی تـر لە پەروەردگاریـانەوە جیاوازی ناکەین لە نێـوان هـیچ کامێـک لەم پێغەمـبەرانە وئـێمە بـۆ خـوای گەورە ملکەچین (گەردن کەچین وگوێڕایەڵین -مسوڵمانین-) } [آل عمـران:٨٤]. وبـاوەڕی هەبێت بە کۆتا پێغەمبەر کە موحەممەدە -صلى الله علـيە وسـلم- ودوایـین پەیـامبەر ونێردراوی خودایە -علیهم الصلاة والسلام-، خوای گەورە دەفەرموێت: { إِذ أَخَـذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَا ءَاتَيتُكُم مِّن كِتَٰبٍ وَحِكمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُم رَسُولٌ مُّصَـدِّقٌ لِّـمَا مَعَكُـم لَتُؤمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ قَالَ ءَأَقرَرتُم وَأَخَذتُم عَلَىٰ ذَٰلِكُم إِصرِي قَالُوٓاْ أَقرَرنَا قَـالَ فَٱشـهَدُواْ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّـٰهِدِينَ} واتە: {کاتێک کە خودا پەیمانی وەرگرت لە پێغەمـبەران کە هەرچیم پێدان لە نامە وحیکمەت وشەریعەت لە پاشان پێغەمبەرێکتان بۆ هـات کە بڕواهێنەرە بەو پەیامەی کە لە لاتانە دەبێت بـڕوای پـێ بهێـنن ویـارمەتی بـدەن، خودا فەرمووی: ئایا دانتان نا بەم پەیمانەدا؟ و لەسەر ئەوە پەیمانـی منتـان وەرگـرت

پێغەمبەران ووتیان: بەڵێ دانمان پێدانا وپەیمانمان بەست، خـودا فەرمـووی: کەواتە ئێوە بە شاهێد بن ومنیش لەگەڵ ئێوە یەکێکم لە شـاهێدان} [آل عمـران:٨١] ئـاینی ئیسـلام باوەڕهێنـان بە هەمـوو پێغەمـبەران واجـب دەکـات بە شـێوەیەکی گشـتی، وهەروەها باوەڕهێنان بە کۆتا پێغەمبەر کە موحەممەدە -صلى الله عليه وسلم- واجـب دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت: {قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَسْتُمْ عَـلَىٰ شَيْءٍ حَتَّـىٰ تُقِيمُـوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ} واتە: {(ئەی موحەممەد -صـلى الله عليـه وسلم-) بڵێ ئەی خاوەن کتێبەکان -مەبەست گـاوڕ وجووەکـانە- ئێـوە لەسـەر هـیچ شتێک نین هەتا بە ڕێک وڕاسـتی پەیـڕەوی تەورات وئینجیـل نەکەن هەروەهـا ئەو قورئـانەی کە هێـنراوەتە خـوارەوە بۆتـان لە لایەن پەروەردگارتـانەوە} [المائـدة:٦٨].

وخوای گەورە دەفەرموێت: { قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّـن دُونِ اللَّهِ فَـإِن تَوَلَّـوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ } واتە: { (ئەی موحەممەد -صلى الله عليه وسلم-) پێیان بڵێ: ئەی خاوەن پەیامەکان وەرن بۆ لای وتەیەکی ڕاست و(یەکسان) لە نێوان ئـێمە وئێوەدا کە جگە لە خوا هـیچ نەپەرسـتین وهـیچ شـتێک نەکەیـن بە هاوبەشـی (لە پەرستنیدا) وهەندێکمان هەندێکمان بە پەروەردگار دانەنێین ئەمجا ئەگەر پشـتیان هەڵکرد ئێوەش بڵێن: ئێوە شاهید بن کە ئـێمە فەرمـانبەردار وگـوێڕایەڵ وملکەچـی خوداین } [آل عمران:٦٤]. وئەوەی کوفر وبێباوەڕ بێت بە یەک پێغەمبەر وەکـو ئەوە وایە بێباوەڕ بووبێـت بە هەمـوو پێغەمـبەران -علـيهم السـلام- وبـۆیە خـوای گەورە سەبارەت بە حیکمەت ودانایییەکانی لەسەر قەومی نـوح دەفەرموێـت: { كَـذَّبَتْ قَـوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ } واتە: { گەلی نوح پێغەمبەرانیان بە درۆزن دانا (بڕوایان پێنەکردن) } [الشعراء:١٠٥]. وئاشکرایە کە لە پێش نوح هیچ پەیامبەرێـک -نێردراوێـک: رسـول- نەهـاتووە و لەگەڵ ئەوەیشـدا کاتێـک کە قەومەکەی بە درۆیـان خسـتەوە ئەم بە

درۆخستنەوەیە وەکو بەدرۆدانان وبێباوەڕ بوون بە هەموو پێغەمبەران دادەنرێت، چونکە بانگەواز وئامانجی هەموو پێغەمبەران هەمان مەبەستە (یەک مەبەستە).

پێنجەم: باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی واتا قیامەت، ولە کۆتایی ئەم ژیانەدا خودا فەرمان دەکات بە فریشتەیەک بەناوی ئیسرافیل -علیە السلام- بۆیە فوو دەکات بە نێو کەڕەنادا (صور)دا بۆیە هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان زەویدا دەمرن بە پێی ویستی خودا، خوای گەورە دەفەرموێت: { وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ } واتە: { کاتێك فووکرا بەکەڕەنادا (بە شەیپوردا) دەکرێت یەکسەر هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان وزەویدان دەمرن مەگەر کەسانێك خودا بیەوێت (نەمرن) پاشان جارێکی تر فوو دەکرێت بە کەڕەنادا جا لە پڕ هەموو ڕاست دەبنەوە چاوەڕوان دەکەن } [الزمر:٦٨]. وکاتێک هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان وزەویدان تیا دەچن ودەمرن جگە لە ئەوانەی کە خودا بیەوێت (کە نەمرن)؛ ئەوا خوای گەورە ئاسمانەکان وزەوی دەپێچێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: { يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ } واتە: {(بیهێنەوە بیریان) ئەو ڕۆژەی کە ئاسمانەکان دەپێچینەوە وەک پێچانەوە (لولکردنی) تۆماری کتێب وپەرتوکێک وەک یەکەمجار چۆن دروستمان کرد (بە ڕووت وقووتی)، پاش مردنیش ئەو (دروستکردنە) دووبارە دەکەینەوە ئەوە بەڵێنێکە (جێبەجێ کردنی) لەسەر ئێمەیە بێگومان ئێمە (ئەو بەڵێنە) بەدی دەهێنین} [الأنبياء:١٠٤]. وخوای گەورە دەفەرموێت: { وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ } واتە: {(کافران) خوایان نەناسیووە (بە گەورەیان نەزانی) بەو جۆرەی شیاویەتی لە ڕۆژی دواییدا هەموو زەوی لە چنگی ئەودایە (بەدەست خوایە) وئاسمانەکانیش بە دەستی

ڕاستی ئەو پێچراونەتەوە (لەم ئایەتەدا جێگیرکردن سیفەتی دەستی ڕاست بۆ خودا هاتووە ئێمە باوەڕمان پێیەتی، بەبێ هیچ لێچواندن ولێکدانەوەیەك وشێوەکەی نازانین، تەنها خودا دەیزانێت) خودا پاك وبڵندترە لەو شەریک وهاوبەشانەی کە ئەوان بۆ خودا بڕیاری دەدەن} [الزمر:٦٧]. وپێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «يَطْوِي اللهُ عَزَّ وَجَلَّ السَّمَاوَاتِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثُمَّ يَأْخُذُهُنَّ بِيَدِهِ الْيُمْنَى ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ أَيْنَ الْجَبَّارُونَ؟ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ؟ ثُمَّ يَطْوِي الْأَرَضِينَ بِشِمَالِهِ ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ أَيْنَ الْجَبَّارُونَ؟ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ؟» واتە: «خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا ئاسمانەکان بە دەستی ڕاستی دەپێچێتەوە ودەفەرموێت: «من پادشام لە کوێن سەرکوتکەرەکان -ستەمکەرەکان-؟ لە کوێن خۆبەگەورەزانەکان؟ پاشان زەوییەکان بە دەستی چەپی دەپێچێتەوە ودەفەرموێت: من پادشام لە کوێن سەرکوتکەرەکان؟ لە کوێن خۆبەگەورەزانەکان؟»]. [رواه مسلم]. پاشان خوای گەورە فەرماندەکات بە فریشتەکە بۆیە جارێکی تر فوو دەکات بە کەڕەناکەدا وخەڵکی هەمووی زیندوو دەبنەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: {ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ} واتە: {پاشان جارێکی تر فوو دەکرێت بە کەڕەنادا جا لە پڕ هەموو ڕاست دەبنەوە وچاوەڕوان دەکەن} [الزمر:٦٨]. ئەگەر خوای گەورە خەڵکی زیندوو بکاتەوە؛ کۆیان دەکاتەوە (حەشریان دەکات) بەرەو لێپرسینەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: {يَوْمَ تَشَقَّقُ الْأَرْضُ عَنْهُمْ سِرَاعًا ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ} واتە: {ڕۆژێك دێت زەوی لە ئاست ئەوانەی (مردوون) قڵیش دەبات بەپەلە (دێنە دەرەوە) ئەو کۆکردنەوە بە لای ئێمەوە ئاسانە} [ق:٤٤]. وخوای گەورە دەفەرموێت: { يَوْمَ هُم بَارِزُونَ لَا يَخْفَىٰ عَلَى اللَّهِ مِنْهُمْ شَيْءٌ لِّمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ } واتە: {ڕۆژێك کە هەموو (لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە) ئاشکرا دەبن هیچ شتێکیان لە خودا پەنهان نابێت (خوا دەفەرمووێت) ئەمڕۆ پادشایەتی ودەسەڵات بۆ کێیە (وەڵام

نادرێتەوە)، (خۆی وەڵام دەداتەوە و دەفەرمووێت): هەر بۆ خوای تاك وتەنهـایە کە بە سەر هەموو شتێکدا زاڵە} [غافر:١٦]. لەم ڕۆژەدا خوای گەورە لێپرسینەوە لە هەموو خەڵکی دەکات، وماف بۆ ستەملێکراوان دەگەڕێندرێتەوە لەو کەسـەی کە سـتەمی لێکردوون، وپاداشـتی هەمـوو مرۆڤێـک دەداتەوە بە ئەنـدازەی کردەوەکـانی، خـوای گەورە دەفەرموێت: {الْيَوْمَ تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ لَا ظُلْـمَ الْيَـوْمَ إِنَّ اللَّهَ سَرِيـعُ الْحِسَابِ} واتە: {ئەمڕۆ هەموو کەس پاداشت یان سـزا دەدرێـتەوە بە گـوێرەی ئەوەی ئەنجامیداوە ئەمڕۆ ستەم کردن نییە لە کەس، بەڕاسـتی لێپرسـینەوەی خـودا بەپەلە وخێرایە} [غافر:١٧]. وخـوای گەورە دەفەرموێـت: {إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِـمُ مِثْقَـالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا} واتە: {بە ڕاستی خودا بە ئەنـدازەی گەردیـلەیەک سـتەم ناکـات وئەگەر چـاکەیەک هەبێـت (خـودا) پاداشـتەکەی چەندجارە دەکاتەوە ودەیبەخشێت لە لایەن خۆیەوە پاداشتێکی گەورە} [النساء:٤٠]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ (٧) ئەمجا هەرکەسێك بە ئەندازەی هەرە ووردیلەیەك چاکەی کردبێت دەیبینێتەوە (٧) وَمَن يَعْمَـلْ مِثْقَـالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَـرَهُ (٨) و هەرکەسـێك بە ئەنـدازەی هەرە ووردیـلەیەك خـراپەی کردبێـت دەیبینێـتەوە (٨)} [الزلزلـة:٧-٨]. وخـوای گەورە دەفەرموێـت: { وَنَضَـعُ الْمَـوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَـرْدَلٍ أَتَيْنَـا بِهَـا وَكَفَىٰ بِنَا حَاسِبِينَ} واتە: {وئێمە دادەنێـین تەرازووەکـانی دادپەروەری (کە کـردەوەی پێ دەکێشرێت) لە ڕۆژی قیامەتدا ئەمجا هیچ کەس کەمترین ستەمی لێناکرێـت بـا قورسی (کردەوەکەی) هێندەی تۆوی خەرتەلەیەکیش بێت ئێمە دەیهێنین وبەسـە کە ئێمە ژمێریـاری (کـردەوەی بەنـدەکان) بـین} [الأنبیـاء:٤٧]. وپـاش زینـدووبوونەوە ولێپرسینەوە پاداشت هەیە بـۆیە ئەوەی ئیمانـی هێنابێـت وخێـر وکـردەوی چـاکەی ئەنجامدابێت ئەوا نیعمەت وخێری بەردەوامی بۆ هەیە کە هەرگیز لێی دانابڕێـت بـۆ

هەتاهەتایە لە بەهەشتدا، وئەوەی کوفر وبێباوەڕ بێت وشەڕ وخـراپەی کردبێـت ئەوا سزای هەتاهەتایی بۆ هەیە لە دۆزەخدا، خـوای گەورە دەفەرموێـت: { الْمُلْـكُ يَوْمَئِـذٍ لِّلَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فِي جَنَّـاتِ النَّعِـيمِ (٥٦) دەسـەڵات وپاشـایەتی لەو ڕۆژەدا تەنهـا بـۆ خـودایە لە نێوانیانـدا دادوەری دەکـات ئەمجـا ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە وکردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە لە بەهەشتانی پـڕ لە نـاز ونیعمەتدان (٥٦) وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا فَأُولَٰئِكَ لَهُـمْ عَـذَابٌ مُّهِـينٌ (٥٧) وئەو کەسـانەی بێبـاوەڕ بـوون وئایەتەکـانی ئێمەیـان بە درۆ دەزانـی بـۆ ئەوانە سـزای ڕیسـواکەر وسەرشـۆڕکەر هەیە (٥٧)} [الحـج:٥٦-٥٧]. ودەبێـت بـزانین ئەگەر ئەم ژیانە کۆتایی بووایە، ئەوا ئەم ژیان وبوونە تەنها بۆ گاڵتە وگەپ وبێ هۆ بـوو، خـوای گەورە دەفەرموێت: { أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ } واتە: {ئایا ئێوە گومانتان وا بووە کە بێگومـان ئێوەمـان بە بـێ هـۆی (بـۆ یـاری وگـاڵتە وگەپ) دروسـتکردووە، و (وا گومانتـان دەبـرد) بێگومـان ئێـوە نـاگەڕێنەوە بـۆلای ئـێمە؟} [المؤمنون:١١٥].

شەشەم: باوەڕهێنان بە قەزا وقەدەر کە ئەمیش ئەوەیە واجبە مرۆڤ باوەڕی وابێت کە خودا هەموو شتێک کە ڕوویداوە وڕوودەدات لە داهاتوودا لەم گەردوونەدا پێـی دەزانێـت وزانسـتی سـەبارەتی هەیە، وخـوای گەورە هەمـوو ئەم ڕووداوانەی نووسیووە پێش دروستکردنی ئاسمانەکان وزەوی، خوای گەورە دەفەرموێت: { وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْـبَرِّ وَالْبَحْـرِ وَمَـا تَسْـقُطُ مِـن وَرَقَـةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الْأَرْضِ وَلَا رَطْـبٍ وَلَا يَـابِسٍ إِلَّا فِي كِتَـابٍ مُّبِـينٍ } واتە: { وکلیلـی هەمـوو نهێنیەکـان هەر لای خـودایە کەس نایانزانێـت جـگە لە (خـودا) و(خودا) دەزانێت چی لە وشکانی ودەریـادا هەیە وهەرگەڵایەک بکەوێـتە خـوارەوە خـودا پێـی دەزانێـت وهەردانەوێـڵەیەک لە تاریکیەکـانی زەویـدا بێـت وهەرتەڕ و

وشـكێک هەبێـت هەر هەموویـان لە کتێبـی ئاشـکران لە (لـوح المحفـوظ) دان } [الأنعام:٥٩]. وزانستی خودا دەوری هەموو شتێکی داوە وزانستی بە هەموو شـتێک هەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: {اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِـنَ الْأَرْضِ مِـثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَـدْ أَحَـاطَ بِكُـلِّ شَيْءٍ عِلْـمًا} واتە: {خـودا زاتـێکە کە حەوت ئاسـمانی دروسـتکردووە وبە وێـنەی ئەوان زەویشی دروستکردووە، فەرمانی خودا لە نێوانیاندا دادەبەزێت تا چاك بزانن کە خودا بەسـەر هەمـوو شـتێکدا بە دەسـەڵات وبە توانـایە وبێگومـان خـودا (بە زانسـت وزانیـاری) دەوری هەمـوو شـتێکی داوە (واتە: ئاگـاداری هەمـوو بوونەوەرەکـانە)} [الطلاق:١٢]. هەرشتێک یـان ڕووداوێـک ڕووبـدات لەم گەردوونەدا؛ ئەوا لە پـاش ویست وتوانا و(ئیرادەت) ودەسـەڵاتی خـودا بـووە وهەروەهـا لە پـاش دروسـتکردن وبەدیهێنان وئاسان کردنی هۆکارەکـان بـووە لە لایەن خـوای گەورەوە، خـوای گەورە دەفەرموێت: {الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْـكِ وَخَلَـقَ كُـلَّ شَيْءٍ فَقَـدَّرَهُ تَقْـدِيرًا } واتە: { ئەو زاتەی کە دەسـەڵاتی بەسـەر ئاسمانەکان وزەویدا هەیە وهەموو موڵکی ئەون وهیچ منداڵی بۆ خـۆی بڕیـار نەداوە وکەس شەریک وهاوبەشی نییە لە فەرمانڕەوایی وحوکم وموڵکـدا وهەمـوو شـتێکی دروسـتکردووە وئەنـدازەی بـۆ دیـاری کـردووە (بە چـاکی لە هەمـوو ڕوویەکەوە) } [الفرقان:٢].

ولەوەشدا ئەوپەڕی حیکمەتی ئەو زاتە مەزنەی تێدایە کە خەڵکـی هەرگیـز ناتوانن درکی پێبکەن ولێی تێبگەن، خوای گەورە دەفەرموێت: {حِكْمَةٌ بَالِغَةٌ فَمَا تُغْنِ النُّذُرُ} واتە: {(قورئان) هەمووی حیکمەتێکی تەواوە بەڵام ترساندنی ترسێنەران (بـۆ قەومێکی بێباوەڕ) سوودی نییە} [القمر:٥]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {وَهُـوَ الَّـذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ وَلَهُ الْمَثَـلُ الْأَعْـلَى فِي السَّـمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُـوَ

الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ} واته: {ئەو (خودا) زاتێکە بەدیهێنـانی دەسـتپێکردووە لە پاشـان (دوا مردنی) دووبارە دروسـتی دەکـاتەوە ئەم (دروسـت کـردنەوەی دووەم) لە لای خـودا ئاسانترە وهەر تەنها بۆ ئەوە (هەموو) سیفەتێکی بەرز وبڵند لە ئاسمانەکان وزەویـدا وهەر ئەو شکۆدار ودانایە} [الروم:٢٧]. وخوای گەورە خـۆی بە دانـا وبە حـیکمەت وەسفکردووە، وناوی (الحکیم) واتا -دانا-ی لە خۆی ناوە، خوای گەورە دەفەرموێـت: {شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ ۚ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيـزُ الْحَكِـــيمُ } واتە: {خـــودا شـــاهێدی دەدات (واتە ڕایـــدەگەیەنێت وبە بەڵـــگە دەیچەسپێنێت) کە بەڕاستی هـیچ پەرسـتراوێکی بە هەق وڕاسـت نیـیە کە شـایەنی پەرستن بێت جگە لە ئەو زاتە مەزنە نەبێت وفریشتەکانیش شـاهێدی دەدەن (واتە: دانیپێدا دەنـێن) وخـاوەن زانسـتەکان (زانایـان)یش شـاهێدی دەدەن (واتە: بـاوەڕی چەسپاویان هەیە)، خودا هەمیشـە دادپەروەری ڕاگرتـووە، هـیچ پەرسـتراوێکی هەق وڕاست نییە کە شایەنی پەرسـتن بێـت جـگە لە ئەو وخـودا شـکۆدار ودانـایە} [آل عمران:١٨]. خوای گەورە لە قورئانی پیـرۆزدا سـەبارەت بە گفتوگـۆی عیسـا -علیـە السلام- لەگەڵ خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا دەفەرموێت: کە عیسا -علیە السلام- دەفەرموێت: {إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ} واتە: {ئەگەر سزایان بدەیت، ئەوە بێگومان بەندەی خۆتن وئەگەر لێشیان خۆش بیت ئەوە بێگومان تەنها خۆت شکۆدار ودانایت} [المائدة:١١٨]. کاتێک موسا -علیە السلام- لە شوێنێکی تەنیشتی کێور (تور -الطور-) بوو؛ خوای گەورە -سـبحانە وتعـالی- بـانگی کرد وفەرمووی: {يَا مُوسَىٰ إِنَّـهُ أَنَـا اللَّهُ الْعَزِيـزُ الْحَكِـيمُ} واتە: {ئەی موسـا بەڕاسـتی ئەوەی (بانگی کردی) منم خودای شکۆدار ودانا} [النمل:٩]. وخوای گەورە قورئـانی پیرۆزی بە حیکمەت -دانایی- وەسفکردووە، هەروەکو -سبحانە وتعالی- دەفەرموێـت: {الر ۚ كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِـيمٍ خَبِـيرٍ} واتە: {بە (ئەلیـف، لام،

ڕا) دەخوێنـــدرێتەوە خـــودا زانـــاترە بە مانـــاکەی، ئەمە کتێبـــێکە پـــتەو داڕێـــژراوە ئایەتەکانی پاشان ڕوون کراونەتەوە لە لایەن (خودای) دانا وزاناوە} [هود:١]. وخوای گەورە دەفەرمووێت: { ذَٰلِكَ مِمَّا أَوْحَىٰ إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ الْحِكْمَةِ ۗ وَلَا تَجْعَلْ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ فَتُلْقَىٰ فِي جَهَنَّمَ مَلُومًا مَّدْحُورًا} واتە: {ئەوەی (کـــە باسـکرا) هەنـدێکە لەو دانـایی وحیکمـەتەی کە پەروەردگارت نیگای کردووە بۆت وهـیچ پـەرستراوێکی تر لەگەڵ خـــوادا مەپەرســـتە ئەگینـــا فـــڕێ دەدرێیـــتە نێـــو دۆزەخەوە بە لـــۆمەکراوی ودوورخراوەیی لە بەزەیی وڕەحمەتی خودا} [الإسراء:٣٩].

**٢٢. وپێغەمــبەران -علــیهم الســلام- پــارێزراون (مەعســومن) لەو پەیامــانەی کە دەیگەیەنــن لە لایەن خـــوداوە، وهەروەهـــا پـــارێزراون لە توشبوون بە هەرشتێک کە پێچەوانەی ئەقڵی تەندروست وڕەوشتی جوان بێـــت، وپێغەمـــبەران گەیانـــدنی پەیامەکـــانی خودایـــان پێســـپێردراوە بـــۆ بەنـــدەکانی، وپێغەمـــبەران هـــیچ تایبەتمەنـــدییەکی پەروەردگـــارێتی یـــان خودایەتی (ئولوهیەت:پەرستن)یان نیـیە، بەڵکـو ئەوان مـرۆڤێکن وەکـو هەمـــوو مرۆڤەکـــان بەڵام جیاوازییـــان لەوەدایە کە خـــودا وەحییـــان (سروشیان) بۆ دەنێرێت کە پەیامەکانی خودای تێدایە.**

وپێغەمـبەران -علـیهم السـلام- پـارێزراون (مەعسـومن) لەو پەیامـانەی کە دەیگەیەنن لە لایەن خوداوە، چونکە خوای گەورە باشترین وچاکترین بوونەوەرەکـان هەڵدەبژێرێت بۆ ئەوەی پەیامەکانی خودا بگەیەنن، خـوای گەورە دەفەرموێـت: {اللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ الْمَلَائِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ النَّاسِ ۚ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ} واتە: {خـودا لە فریشتەکاندا نێردراو هەڵدەبژێرێت هەروەها لە خەڵکیشـدا بەڕاسـتی خـودا بیسـەر

وبینایه} [الحج:٧٥]. وهەروەها خوای گەورە دەفەرمویت: { إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحٗا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ} واتە: {بێگومان خودا هەڵیبژاردووە ئادەم ونوح وخانەوادەی ئیبراهیم وخانەوادەی عیمران بەسەر هەموو جیهانیاندا} [آل عمران:٣٣]. وهەروەها خوای گەورە دەفەرمویت: { قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي فَخُذۡ مَآ ءَاتَيۡتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ} واتە: {(پەروەردگار) فەرمووی: ئەی موسا بێگومان من تۆم هەڵبژاردوە بەسەر هەموو خەڵکیدا بە پەیامەکانم وقسەکردنم (لەگەڵت ڕاستەوخۆ) کەواتە ئەوەی پێم بەخشیوویت توند دەستی پێوە بگرە ولە سوپاسگوزاران بە} [الأعراف:١٤٤]. وپێغەمبەران -علیهم السلام- دەزانن کە ئەوەی بۆیان دادەبەزێت وەحیە لە لایەن خوداوە، وئەو فریشتانە دەبینن کە وەحی دەهێنن، خوای گەورە دەفەرمویت: {عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِ أَحَدًا (٢٦) هەر خودا زانا بە نهێنیەکان وکەس ئاگادار ناکات بەسەر نهێنی خۆیدا (٢٦) إِلَّا مَنِ ارْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَدًا (٢٧) مەگەر بۆ پێغەمبەرێك کە خۆی ڕازی بێت، جا بێگومان خودا لە پێشەوە وپشتیەوە پاسەوان (لە فریشتە) دەنێرێت (٢٧) لِّيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُوا رِسَالَاتِ رَبِّهِمْ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَيْءٍ عَدَدًا (٢٨) تا بزانێت کە پەیامی خودای خۆیان گەیاندووە وخودا ئاگادارە بەوەی کە لایانە وهەموو شتێکی (لەسەریان) ژماردووە بە هەڵژماردن (٢٨)} [الجن:٢٦-٢٨].

وخوای گەورە فەرمانی پێیانکرد بەوەی کە پەیامەکانی خودا بگەیەنن وبانگەوازی بۆ بکەن، خوای گەورە دەفەرمویت: {يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ} واتە: {ئەی (پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم-) ڕایبگەیەنە (بە خەڵک) ئەوەی هێنراوەتە خوارەوە بۆت لە لایەن پەروەردگارتەوە، وئەگەر وانەکەیت

ئەوا پەیامەکەی خودات ڕانەگەیاندووە وبە جێت نەهێناوە، وخودا تۆ دەپارێزێت لە خەڵکی (کە بتکوژن) بێگومان خودا ڕێنمونی بێباوەڕان ناکات (هیدایەتیان نادات)} [المائدة:٦٧]. وهەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: {رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا} واتە: {پێغەمبەرانمان ناردووە بۆ ئەوەی کە موژدەدەر وترسێنەر بن بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی نەبێت بەڵگە بەسەر خوداوە بهێنن دوای (ناردنی) پێغەمبەران وخودا هەمیشە شکۆدار ودانایە} [النساء:١٦٥]. وپێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام- تەقوادارترین ولە خودا ترسترین مرۆڤ بوون بۆیە هیچ شتێک بۆ سەر پەیامەکەی خودا لە لایەن خۆیانەوە زیاد ناکەن وهیچیشی لێ کەم ناکەنەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: { وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ (٤٤) ئەگەر (موحەممەد -صلى الله علیه وسلم-) بە ناوی ئێمەوە هەندێك (وتەی) هەڵببەستایە (٤٤) لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ (٤٥) بێگومان ئێمە بە دەستی خۆمان تۆڵەمان لێدەسەند (٤٥) ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ (٤٦) لە پاشان ڕەگی دڵیمان دەبڕی (٤٦) فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ (٤٧) وهیچ کەسێک لە ئێوە نەیدەتوانی بەرگری لێبکات (٤٧)} [الحاقة:٤٤-٤٧]. ئیبن کثیر -ڕەحمەتی خوای لێبێت- دەڵێت: خوای گەورە دەفەرموێت: {وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا} واتە: {خۆ ئەگەر موحەممەد -صلى الله علیه وسلم- هەندێك قسە و گوفتاری بە ناوی ئێمەوە هەڵبەستایە} واتا ئەگەر بەو شێوەیە بووایە کە موشریک وبێباوەڕەکان بانگەشە دەکەن بە شێوەیەک کە شتێکی زیاد بکردایە بۆ پەیامەکەی خودا یان لێی کەم بکردایەتەوە لە لایەن خودی خۆیەوە و بانگەشەی ئەوەی بکردایە کە خودا ئەمەی فەرمووە -لە کاتێکیشدا ئەوە ڕاست نەبێت- ئەوا بەپەلە سزامان دەدا، بۆیە خوای گەورە فەرمووی: {لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ} واتە: {ئەوا بە دەستی ڕاست دەیبەینەوە (تۆڵەی لێدەسێنین وسزای دەدەین)}، ووتراوە: مەبەست لە باسکردنی دەستی ڕاست

ئەوەیە چونکە بەهێزترە لە کاتی تۆڵەسەندنەوەدا، ووتراوە: ئێمە تۆڵە لە ئەو دەسێنین سەرەتا بە لای ڕاستی (لاشەی) دەستپێدەکەین. وهەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: {وَإِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّۚ إِن كُنتُ قُلۡتُهُۥ فَقَدۡ عَلِمۡتَهُۥۚ تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ (١١٦) مَا قُلۡتُ لَهُمۡ إِلَّا مَآ أَمَرۡتَنِي بِهِۦٓ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۚ وَكُنتُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا مَّا دُمۡتُ فِيهِمۡۖ فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيۡهِمۡۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ (١١٧)} واتە: {خودا (لە ڕۆژی قیامەتدا) دەفەرمووێت: ئەی عیسای کوڕی مەریەم ئایا تۆ ووتووتە بە خەڵکی کە من ودایکم بە دوو پەرستراو دابنێن (وبمانپەرستن) لە جیاتی خودا؟ (عیسا) ووتی پاک وبێگەردی بۆ تۆ ئەی خودایە نابێت وناگونجێت بۆ من شتێک بڵێم کە بە هیچ شێوەیەک مافی من نییە ئەگەر من ئەو قسەیەم کردبێت ئەوە بەڕاستی تۆ ئاگات لێیە چونکە تۆ ئەوەی لە نەفسم دایە دەیزانی بەڵام مـن نـازانم و بێ ئاگـام لەوەی کە لە نەفسی تۆدایە بەڕاستی تەنها تۆ زانای تەواوی بە هەموو نهێنـیەک (١١٦) هـیچم پێ نەوتوون بێجگە لەوە نەبێت کە تۆ فەرمانت پێکردووم کە تەنهـا خـودا بپەرسـتن کە پەروەردگاری من وئێوەیشە ومن شایەت وچاودێر بووم بە سەریانەوە تـا لە ناویانـدا بووم ئەمجا کاتێک تۆ منت بردەوە (و بەرزت کردمەوە بۆ ئاسمان) هەر خۆت چاودێر بـووی بەسـەریانەوە, وخـۆت ئاگـادار وشـاهێدی بەسـەر هەمـوو شـتێکەوە (١١٧)} [المائدة:١١٦-١١٧].

وله فەزڵی خودا بەسەر پێغەمبەرانەوە -علیهم الصلاة والسـلام- ئەوەیە کە خوای گەورە جێگیریان دەکات لەسـەر ڕێبـازی وڕاسـت وگەیانـدنی پەیـامی هەق، خوای گەورە دەفەرموێت: {قَالَ إِنِّي أُشْهِدُ اللَّهَ وَاشْـهَدُوا أَنِّي بَـرِيءٌ مِـمَّا تُشْرِكُونَ (٥٤) (پێغەمبەر هود -علیه السلام-) ووتی: بەڕاستی من خودا دەکەم بە شـاهێد وئێـوەش

شـاهێد بـن کە بەڕاسـتی مـن بەریـئم ودوورم لەوەی کە ئێـوە دەیـکەنە هـاوبەش وشەریک بۆ خودا (٥٤) مِنْ دُونِهِ فَكِيدُونِي جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنْظِرُونِ (٥٥) جگە لە خـودا جا هەمووتان پیلانم لێبگێڕن لە پاشان مۆڵەتیشم مەدەن (ولـێم مەوەسـتن) (٥٥) إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُمْ مَـا مِـنْ دَابَّـةٍ إِلَّا هُـوَ آخِـذٌ بِنَاصِيَتِهَا إِنَّ رَبِّي عَـلَى صِرَاطٍ مُسْـتَقِيمٍ (٥٦) بەڕاسـتی مـن پشـتم بە خـودا بەسـتووە کە پەروەردگـاری مـن وپەروەردگاری ئێوەیشە گیانلەبەرێـک نیـیە لە ژێـر ڕکێفـی خـوای گەورەدا نەبێـت (بگری پێشە سەریەتی) بەڕاستی پەروەردگارم لەسەر ڕێگەیەکی ڕاستە (٥٦)} [هـود ٥٤-٥٦]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {وَإِن كَادُوا لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ الَّـذِي أَوْحَيْنَـا إِلَيْـكَ لِتَفْتَرِيَ عَلَيْنَا غَيْرَهُ وَإِذًا لَّاتَّخَذُوكَ خَلِيلًا (٧٣) وبە ڕاستی نزیک بوو ئەوانە لاتدەن و وەرتگێڕن لە ئەوەی کە نیگامان کرد بۆت بۆ ئەوەی جگە لە قورئان شـتێک بە نـاوی ئێمەوە هەڵبەستیت (ئەگەر گوێڕایەڵیان بوویتایە) ئەوە لەو کاتەدا دەیـان کردیـت بە دۆست وخۆشەویستی خۆیان و (گومڕایـان دەکردیـت) (٧٣) وَلَـوْلَا أَن ثَبَّتْنَـاكَ لَقَـدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئًا قَلِيلًا (٧٤) خۆ ئەگەر ئێمە تۆمان دامەزراو نەکردایە بەڕاستی نزیک بوو لەوەی کەمێک بە لایاندا بچیت (٧٤) إِذًا لَّأَذَقْنَاكَ ضِعْفَ الْحَيَـاةِ وَضِـعْفَ الْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا (٧٥) جا بێگومان ئەو کاتە پێمان دەچەشتی دوو بەرامـبەر (سـزای) ژیـان دوو بەرامـبەر (سـزای) مـردن پاشـان دەسـتت نەدەکەوت یارمەتیـدەرێک بەرامـبەر بە ئـێمە (کە بەرگـری ئەو سـزایەت لـێ بکـات) (٧٥)} [الإسراء:٧٣-٧٥]. وئەم ئایەتانە وئەوانەی پێشووتر بەڵگە وشـاهێدن لەسـەر ئەوەی کە قورئـان لە لایەن خـوای گەورە دابەزیـووە؛ چـونکە ئەگەر لە لایەن پێغەمـبەر موحەمەد -صلى الله عليه وسلم- بووایە ئەوا هاوشێوەی ئەم قسـانەی تێـدا نەدەبـوو کە ئاراستەی ئەو کراوە. وخوای گەورە -سبحانە وتعالى- پێغەمبەرانـی دەپارێزێـت لە خەڵکی، خوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِـن رَّبِّـكَ وَإِن

لَّـمْ تَفْعَـلْ فَـمَا بَلَّغْـتَ رِسَـالَتَهُ وَاللَّهُ يَعْصِـمُكَ مِـنَ النَّـاسِ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْـدِي الْقَـوْمَ الْكَافِرِينَ} واته: {ئەی (پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم-) ڕایـبگەیەنە (بە خەڵـک) ئەوەی هێـنراوەتە خـوارەوە بـۆت لە لایەن پەروەردگـارتەوە, وئەگەر وانەکەیـت ئەوا پەیامەکەی خـودات ڕانەگەیانـدووە وبە جێـت نەهێنـاوە، وخـودا تـۆ دەپارێزێـت لە خەڵکی (کە بتکوژن) بێگومان خودا ڕێنمونی بێباوەڕان ناکات (هیدایەتیان نادات)} [المائدة:٦٧]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ نُوحٍ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَـيْكُم مَّقَـامِي وَتَـذْكِيرِي بِآيَـاتِ اللَّهِ فَعَـلَى اللَّهِ تَوَكَّلْـتُ فَـأَجْمِعُوا أَمْـرَكُمْ وَشُرَكَاءَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُنْ أَمْرُكُمْ عَلَيْكُمْ غُمَّـةً ثُـمَّ اقْضُـوا إِلَيَّ وَلَا تُنظِـرُونِ } واته: { (ئەی موحەممەد -صلی الله علیه وسلم-) دەنگوباس وهەواڵی نوح -علیه السلام- یـان بـۆ بخـوێنەرەوە کاتێـک بە گەلەکەی ووت: ئەی گەلەکەم ئەگەر بە لاتـانەوە قـورس وگرانە مانەوەم لەناوتاندا وئامۆژگاری کردنم بۆتان بە ئایەتەکانی خودا ئەوا من پشتم بە خودا بەستووە ئێوەش کار وبڕیاری خۆتـان کـۆ بـکەنەوە لەگەڵ هاوبەشـەکانتاندا ئەمجا با کار وبڕیارەکانتان شاراوە نەبێت بە لاتانەوە (بەڵکو با ئاشکرا بێـت) پاشـان پەلامارم بدەن وماوەم مەدەن } [یونس:٧١].

خوای گەورە سەبارەت بە وتەی موسا وهارون -علیهما السـلام- لە قورئـانی پیرۆزدا دەفەرموێت: کە موسا وهارون -علـیهما السـلام- فەرموویـانە، پاشـان خـودا وەڵامیان دەداتەوە: {قَالَا رَبَّنَا إِنَّنَا نَخَـافُ أَن يَفْـرُطَ عَلَيْنَـا أَوْ أَن يَطْغَـىٰ (٤٥) قَـالَ لَا تَخَافَا إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَىٰ (٤٦)} واتە: {هەردووکیان ووتیان ئەی پەروەردگارمـان بەڕاستی ئێمە دەترسین دەستدرێژی بکاتە سەرمان پێش ئەوەی ئێمە هیچ بڵێین یـان زیـاتر یـاخی وسـەرکەش ببێـت (٤٥) (خـودا) فەرمـووی: مەترسـن بەڕاسـتی مـن لەگەڵتـــانم دەبیســـتم ودەبیـــنم (٤٦)} [طـــە:٤٥-٤٦]. خـــوای گەورە ئەوەی ڕوونکردووەتەوە کە پێغەمبەرانی دەپارێزێـت -علـیهم السـلام- لە دوژمنانیـان بـۆیە

ناتوان زیانیان پێبگەیەنن، وخوای گەورە باسی ئەوەی کردووە کە کۆتا وەحی (قورئان وسونەت) دەپارێزێت بۆیە کەس ناتوانێت بۆیان زیاد بکات یـان لێیـان کەم بکـاتەوە یان دەستکاریان بکات وبیانگۆڕێت، خوای گەورە دەفەرموێت: {إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ} واتە: {بێگومان هەر ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە وبەڕاستی هەر ئێمەش دەیپارێزین} [الحجر : ٩].

وپێغەمـبەران -علـیهم السـلام- پـارێزراون (مەعسـومن) لە تووشـبوون بە هەرشتێک کە پێچەوانەی ئەقڵی تەندروست ورەوشـتی جـوان بێـت؛ خـوای گەورە وەسف وستایشی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- دەکات ودەفەرموێت: {وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ} واتە: {وبە ڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت وئاکـار وخـوویەکی ئێجگـار بەرز وگەورەیت} [القلم:٤]. وهەروەها سەبارەتی دەفەرموێـت: {وَمَـا صَـاحِبُكُم بِمَجنُـون} واتە: {وهاوڕێکەتان (کە موحەممەدە -صلى الـله علـيه وسـلم-) شـێت نیـیە (وەکـو ئەوەی ئێـوە دەیڵـێن)} [التکـویر:٢٢]؛ وئەمـیش بـۆ ئەوەی پەیـامەکەی خـودا بە جـوانترین شـێوە بـگەیەن وپێغەمـبەران -علـیهم السـلام- سـپێردراون بە گەیانـدنی فەرمانەکانی خودا بۆ بەندەکان وهیچ تایبەتمەندیەکی پەروەردگارێتی یان خودایەتیان نییە بەڵکو ئەوان مرۆڤن وەکو هەموو مرۆڤەکانی تر، وتەنها جیاوازییـان لەوەدایە کە خودا پەیامیان بۆ دەنێرێت لە ڕێگەی وەحی، خوای گەورە دەفەرموێت: { قَالَـتْ لَهُـمْ رُسُلُهُمْ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَمَا كَانَ لَنَـا أَن نَّـأْتِيَكُم بِسُـلْطَانٍ إِلَّا بِـإِذْنِ اللَّهِ وَعَـلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّـلِ الْمُؤْمِنُـونَ} واتە: {پێغەمبەرەکانیان پێـیان ووتن ئێمە هەر مرۆڤین وەکو ئێوە بەڵام خودا منەت دەنێـت بەسەر هەرکەسێک لە بەندەکانیدا کە بیەوێت (دەیکاتە پێغەمـبەر) وئـێمە هەرگیـز ناتوانین موعجیزە وبەڵگەیەکتان بۆ بهێنین مەگەر پاش ئیزن ومۆڵەتی خـودا نەبێـت وبا بڕواداران پشـت هەر بە خـودا ببەسـتن} [إبـراهیم:١١]. وخـوای گەورە فەرمـانی

کردووە بە پێغەمبەرەکەی موحەمەد -صلی الله علیه وسلم- کە بە ئومەتەکەی بفەرموویت: {قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا} واتە: {بڵێ: من تەنها مرۆڤێکم وەکو ئێوە بەڵام من وەحیم (سروشم) بۆ دێت سەبارەت بە ئەوەی بەڕاستی پەروەردگاری ئێوە پەروەردگارێکی تاک وتەنهایە جا هەرکەسێک بەتەمایە بگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگاری (لە قیامەتدا) ئەوا با کردەوەی چاک بکات وکەس نەکاتە هاوبەش وشەریکی پەروەردگار لە پەرستنیدا} [الکهف:١١٠].

٢٣. وئاینی ئیسلام بانگەوازی دەکات بۆ تەنها پەرستنی خودا ئەویش بە بنچینەی پەرستنە مەزنەکان کە بریتین لە: ١/نوێژ کردن: کە پێکهاتووە لە وەستان -قیام- ورکوع بردن وسوجدە بردن ویادی خودا وستایشکردنی ونزاکردن، کە مسوڵمان لە ڕۆژێکدا دەبێت پێنج جار نوێژ بکات، وهەموو جیاوازییەکان نامێنێت لە نوێژدا کاتێک هەژار ودەوڵەمەند وسەرۆک وخەڵکی هەمووی پێکەوە لە یەک ڕیزدا ڕادەوەستن بۆ ئەنجامدانی نوێژ. ٢/ وزەکاتدان: ئەمیش ڕێژەیەکی کەمە لە سامان -بە پێی چەند مەرج وڕێژەیەک کە خوای گەورە بڕیاری لەسەر داوە- کە واجبە لە سامانەکان دەربهێندرێت وبدرێت بە هەژارەکان وئەو چینانەی کە دیاریکراوە لە شەریعەتدا لە ساڵێکدا یەک جار. ٣/ ڕۆژووگرتن: بریتیە لە خۆگرتنەوە لە ئەو شتانەی ڕۆژوو دەشکێنن بە درێژایی ڕۆژەکانی مانگی ڕەمەزان، کە مرۆڤ خۆی پەروەردە دەکات

لەسەر ئیرادەت وتوانا وئارامگرتن. ٤/حەج کردن: ئەمیش بریتیە لە مەبەستی سەردانیکردنی ماڵی خوای گەورە بۆ جێبەجێکردنی هەندێک دروشم وپەرستنی دیاریکراو لە شاری مەککەی پیرۆز لەسەر ئەو کەسانە واجبە کە لە تواناکانیاندا هەیە (توانایی دارایی وجەستەیی)، یەکێک لە جوانییەکانی حەجکردن ئەوەیە کە هەمووی بە یەک ئاراستە داوا لە خودا دەکەن وهیچ جیاوازییەک نامێنێت لە نێوان مرۆڤەکاندا چونکە هەموویان هەمان جلیان لەبەردایە وبە یەک شێوە پەرستنەکان ئەنجامدەدەن.

وئاینی ئیسلام بانگی مرۆڤ دەکات بۆ پەرستنی خودا بە ئەنجامدانی پەرستنە مەزنەکان وجگە لەم پەرستنانە، وئەم پەرستنە مەزنانە خوای گەورە واجبی کردبوو لەسەر هەموو پێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام- وئومەتەکانیان، ومەزنترین پەرستنەکان بریتین لە:

یەکەم: نوێژکردن، خوای گەورە لەسەر مسوڵمانان فەرزی کردووە هەروەکو چۆن لەسەر پێغەمبەران -علیهم السلام- وئومەتەکانی پێشوو فەرزی کرد، وفەرمانی بە پێغەمبەر ئیبراهیمی خەلیل کرد -علیه السلام- کە ماڵەکەی (مسجد الحرام) پاک بکاتەوە بۆ تەوافکاران ونوێژخوێنان ئەوانەی لە ڕکوع وسوجدەدان، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَإِذْ جَعَلْنَا الْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا وَاتَّخِذُوا مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى وَعَهِدْنَا إِلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ} واتە: {کاتێک کە کەعبەمان گێڕا بە پەناگەی خەڵکی وجێی ئارامی وئاسایش (پەیمان ووتن) شوێنی ئەو بەردەی ئیبراهیم -علیه سلام- لە سەری ڕادەوەستا -لە کاتی دروست کردنی کەعبە- بکەنە جێگای نوێژ وسپاردمان بە

ئیبراهیم وئیسماعیل کە ماڵەکەم پاک بـکەنەوە بـۆ ئەوانەی کە بە دەوری کەعـبەدا دەسوڕێنەوە، وبۆ ئەوانەی کە تێیدا دەمێنـنەوە، هەروەهـا بـۆ ڕکـوع بەران وسـوجدە بەران} [البقرة:١٢٥]. خوای گەورە لەسەر موسا -علیە السلام- واجبـی کـرد هەر لەو کاتەی یەکەمجار بانگی موسای کرد، خوای گەورە دەفەرموێت: { إِنِّي أَنَا رَبُّكَ فَاخْلَعْ نَعْلَيْـكَ إِنَّـكَ بِـالْوَادِ الْمُقَـدَّسِ طُـوًى (١٢) بەڕاسـتی مـن پەروەردگـاری تـۆم دەی پێڵاوەکانت دابکەنە (لەبەر ڕێزی شوێنەکە) چونکە بێگومان تـۆ لە شـیوی پیـرۆزی (تووا - طووا) دایت (١٢) وَأَنَا اخْتَرْتُكَ فَاسْتَمِعْ لِمَا يُوحَىٰ (١٣) من تۆم هەڵبژاردووە (بۆ پێغەمبەرایەتی) کەواتە گوێ بگرە بۆ ئەوەی نیگا دەکرێت (بۆت) (١٣) إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَٰـهَ إِلَّا أَنَـا فَاعْبُـدْنِي وَأَقِـمِ الصَّـلَاةَ لِـذِكْرِي (١٤) بەڕاسـتی هەر مـن خـوام هـیچ پەرستراوێکی هەق وڕاست نییە جگە لە مـن کەواتە مـن بپەرسـتە بە چـاکی نـوێژ ئەنجامبدە بۆ ئەوەی یادی من بکەیتەوە (١٤)} [طه: ١٢-١٤]. خـوای گەورە سـەبارەت بە وتەکانی عیسا -علیـە السـلام- سـەبارەت بەوەی کە خـودا فەرمـانی پێکـردووە بە ئەنجامدانی نوێژ وزەکات لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: کە عیسـا -علیـە السـلام- فەرموویەتی: {وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْـتُ حَيًّـا} واتە:{وپیرۆز وفەڕداری کردووم لە هەرجێگایەکدا بم وفەرمانی پێداوم بە نـوێژکردن وبە زەکاتدان هەتا لە ژیاندام وزیندووم } [مریم:٣١]. ونوێژکردن لە ئاینی ئیسـلامدا بـریتیە لە وەسـتان -قیـام- وڕکـوع بـردن وسـوجدە بـردن ویـادی خـوای گەورە وستایشـکردنی ونـزا وپـاڕانەوە، مسـوڵمان لە ڕۆژێکـدا دەبێـت پێـنج جـار نـوێژ ئەنجامبدات، خوای گەورە دەفەرموێت: {حَافِظُوا عَلَى الصَّـلَوَاتِ وَالصَّـلَاةِ الْوُسْـطَىٰ وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ} واتە: {ئاگاداری نوێژەکانتان بن وبیانپارێزن و(بە تـایبەتی) نـوێژی ناوەڕاست (کە نوێژی عەسرە) ولە نوێژدا بوەستن بـۆ خـودا بە ئەوپەڕی ملکەچـیەوە (بە بێ قسەکردن)} [البقرة:٢٣٨]. وخـوای گەورە دەفەرموێـت: {أَقِـمِ الصَّـلَاةَ لِـدُلُوكِ

الشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ اللَّيْلِ وَقُـرْآنَ الْفَجْـرِ ۖ إِنَّ قُـرْآنَ الْفَجْـرِ كَـانَ مَشْـهُودًا} واته:{(ئەی موحەممەد -صـلی الـله علـیه وسـلم-) نـوێژ ئەنجامبـدە لە كـاتی لادانـی خـۆر (لە ناوەڕاستی ئاسمان) هەتا (هاتنی) تاریكی شەو هەروەها نوێژی بەیـانی (ئەنجامبـدە) بەڕاستی قورئان خوێندنی نوێژی بەیانی هەمیشە دەبینرێت -ئامادەی دەبن وشاهێدی لەسەر دەدرێت- (لەلایەن فریشتەكانی شەو و ڕۆژەوە)} [الإسراء:٧٨]. و -صلی الله علیه وسلم- دەفەرموێت: «فَأَمَّا الرُّكُوعُ فَعَظِّمُوا فِيـهِ الـرَّبَّ عَـزَّ وَجَـلَّ وَأَمَّـا السُّـجُودُ فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُـمْ» واته:«لە ڕكـوع بردنـدا خـودا بە مەزن وشكۆدار دابنێن*، ولە سوجدە بردنـدا** هەوڵ وكۆششـی زۆر بـدەن بـۆ نـزا كـردن چونكە پێدەچێت زیاتر وەڵامتان بـدرێتەوە» *(مەزنـدانان: (واتـا بڵـێن: زیكـری بە مەزندانانی خودا بخوێنن: "سبحان ربي العظيم" ولەگەڵ ئەم زیكرە دەكرێت زیكری تریش بخوێندرێت بەڵام خوێندنی ئەم زیكرە واجبە)، **(سوجدە بردندا: دەبێـت لە سوجدە بردنیشدا زیكری بە بڵند ومەزندانان بخوێندرێت ئەویش ووتنـی: "سـبحان ربي الأعلى"یە ولەگەڵ ئەم زیكرە دەكرێت زیكری تریش بخوێندرێت بەڵام خوێندنی ئەم زیكرە واجبە، وهەروەها سونەتیشە نزای زۆر بكرێت لە سوجدە بردندا) [صحيح مسلم].

دووەم: وزەكاتدان خودا فەرزی كردووە لەسەر مسوڵمانان هەروەكـو چـۆن فەرزی كردووە لەسەر پێغەمبەرانی پێشوو -علیهم السـلام- وئومەتەكانیـان ئەمـیش ڕێژەیەكی كەمە لە سامان -بە پێی چەند مەرج وڕێـژەیەك كە خـوای گەورە بڕیـاری لەسـەر داوە- كە واجـبە لە سـامانەكان دەربهێنـدرێت وبـدرێت بە هەژارەكـان وئەو چینـانەی كە دیـاریكراوە لە شـەریعەتدا لە سـاڵێكدا یەك جـار، خـوای گەورە دەفەرموێت: {خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَـيْهِمْ ۖ إِنَّ صَـلَاتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ ۗ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ} واته: {وەربگرە لە ماڵ ودارایيان (زەكات و خێركـردن -

سەدەقە-) تا بەهۆیەوە پاکیان بکەیتەوە (لە گوناهـ و تاوان) و(دڵیان) پوخت وخاوێن دەکەیت بەو ماڵ بەخشینە ودوعا ونزای خێریان بۆ بکە بەڕاستی دوعای تـۆ ئـارامی ودڵخۆشییە بۆ ئەوان وخودا بیسەر وزانایە} [التوبة:١٠٣]. وکاتێک پێغەمـبەر -صـلى الله عليه وسلم- موعازی بۆ یەمەن نارد -ڕەزای خوای لێبێت- پێـی فەرمـوو: «إِنَّـكَ تَأْتِي قَوْمًا أَهْلَ كِتَـابٍ فَـادْعُهُم الَى شَـهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلَّا اللهُ وَأَنِّي رَسُـولُ اللهِ فَـإِنْ هُـمْ أَطَاعُوكَ لِذَلِكَ فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْـسَ صَـلَوَاتٍ فِي كُـلِّ يَـوْمٍ وَلَيْلَةٍ فَإِنْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ افْتَرَضَ عَلَـيْهِمْ صَـدَقَةً فِي أَمْـوَالِهِمْ تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ وَتُرَدُّ فِي فُقَرَائِهِمْ فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ لِذَلِكَ فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ وَاتَّـقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ فَإِنَّهَا لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ حِجَابٌ» واتە: «تۆ دەچیت بـۆ لای کەسانێک لە ئەهلی کتێب (جولەکە ونەسڕانیەکان) با یەکەم شت کە بانگەوازی بۆ دەکەیت بریتی بێت لە شاهێدی دان بە (لا إله إلا الله)* وشـاهێدی دان بەوەی مـن پێغەمبەری خودام، ئەگەر لەوەدا گوێڕایەڵ بـوون پێیـان ڕابـگەیەنە کە خـودا پێـنج فەرزی لە سەریان داناوە لە هەمـوو ڕۆژ وشـەوێکدا، ئەگەر لەوەدا گـوێڕایەڵ بـوون پێیان ڕابگەیەنە کە خوای گەورە خێرکردن (زەکات) ی لە سـەریان فەرز کـردووە لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێت ودەدرێت بە هەژارەکان، ئەگەر لەوەدا گوێڕایەڵ بوون ئاگـادار بە لە باشـترین وچـاکترینی پـارە وماڵەکانیـان نەبەیـت، وئاگـاداری نـزای ستەملێکراو بە چـونکە لە نێـوان ئەو وخـوادا هـیچ پەردەیەک نیـیە». *(واتە: هـیچ پەرسـتراوێک هەق وڕاسـت نیـیە کە شـایەنی پەرسـتن بێـت جـگە لە الله) [رواه الترمذي: ٦٢٥].

سێیەم: خوای گەورە ڕۆژووگرتنی فەرزکردووە لەسەر مسوڵمانان هەروەکو چۆن فەرزی کردبوو لەسەر پێغەمبەران ونێردراونی پێشوو -عليهم الصلاة والسـلام- وئومەتەکانیان، خوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَـيْكُمُ الصِّـيَامُ

كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ} واته: {ئەی ئەوانەی كە بڕواتان هێناوە ڕۆژووتان لەسەر نووسراوە وفەرزكراوە هەروەكو چۆن لەسەر ئومەتەكانی پێش ئێوە فەرز كرابوو؛ بۆ ئەوەی خۆتان بپارێزن ولە خودا بترسن} [البقرة:١٨٣]. وڕۆژووگرتن بريتيە لە: خۆگرتنەوە لەو شتانەی كە دەبنە هۆی ڕۆژوو شكاندن لە ماوەی ڕۆژەكانی مانگی ڕەمەزان، وڕۆژووگرتن نەفس ودەروونی مرۆڤ پەروەردە دەكات لەسەر توانا وبەهێزی وئارامگرتن. -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: الصَّوْمُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ يَدَعُ شَهْوَتَهُ وَأَكْلَهُ وَشُرْبَهُ مِنْ أَجْلِي وَالصَّوْمُ جُنَّةٌ وَلِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ: فَرْحَةٌ حِينَ يُفْطِرُ وَفَرْحَةٌ حِينَ يَلْقَى رَبَّهُ» واتە: «خوای گەورە دەفەرموێت: «ڕۆژووگرتن بەدڵنياييەوە بۆ منە ومن پاداشتی لەسەر دەدەمەوە؛ لە بەر من واز لە شەهوەتەكەی (ئارەزووەكەی) وخواردن وخواردنەوەكەی دەهێنێت، وڕۆژووگرتن قەڵغانە (پارێزەرە)، ڕۆژووگر دوو خۆشی بۆ هەیە كە پێيان دڵخۆش وئاسوودە دەبێت: ئەگەر ڕۆژوو بشكێنێت (ئەوا دڵخۆش دەبێت بە ڕۆژوو شكاندنی)، وئەگەر بگاتە لای پەروەردگاری (ئەوا دڵخۆشە بە پاداشتی ڕۆژووگرتنی)» [صحيح البخاري: ٧٤٩٢]،

چوارەم: حەج كردن، خوای گەورە فەرزی كردووە لەسەر مسوڵمانان هەروەكو فەرز كردنی لەسەر پێغەمبەرانی پێشوو -عليهم السلام- وئومەتەكانيان، وخوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەر ئيبراهيمی خەليل كردووە -عليه السلام- كە خەڵكی بانگ بكات بۆ ئەنجامدانی حەج، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ} واتە: {وجاڕ بدە بەناو خەڵكيدا بۆ حەج كردن دێن بۆ لات (بۆ حەج) بە پيادە وبە سواری هەموو وشترێكی لاواز (لەبەر ئەوەی) كە لە هەموو ڕێگايەكی دوورەوە دێن} [الحج : ٢٧]. وخوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەر ئيبراهيم كردووە -عليه السلام- كە ماڵە پارێزراو

وبەنرخەکەی (مسجد الحرام) پاک بکـاتەوە، خـوای گەورە دەفەرموێـت: {وَإِذْ بَوَّأْنَـا لِإِبْرَاهِيمَ مَكَانَ الْبَيْتِ أَن لَّا تُشْرِكْ بِي شَيْئًا وَطَهِّرْ بَيْتِـيَ لِلطَّـائِفِينَ وَالْقَـائِمِينَ وَالرُّكَّـعِ السُّجُودِ} واتە: {(بیریان بخەرەوە) کاتێک دیاریمان کرد بۆ ئیبراهیم (علـیه السـلام) جێگای کەعبە (پێمانـووت) هـیچ شـتێک مەکەرە هاوبەشـم، ومـاڵەکەم (مزگەوتـی حەرام) پـاک بـکەرەوە بـۆ تەوافکـاران وبـۆ نوێژخوێنـان (بە پێـوە) وڕکـوعبەران وسوجدەبەران} [الحـج:٢٦]. وحەج کـردن بـریتیە لە: مەبەسـت لە سـەردانیکردنی ماڵی خودا (مسجد الحرام) لە شاری مەککە بۆ ئەنجامدانی هەندێک کردەوە دروشم وپەرستنی دیاریکراو لەو شارە پیرۆزەدا یەکجار لە تەمەندا؛ ئەمیش لەسەر کەسێک فەرزە کە توانای دارایی وتەندروستی هەبێت، خـوای گەورە دەفەرموێـت: {وَلِلَّهِ عَـلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ} واتە: {خوای گەورەش بڕیاریداوە لەسەر خەڵکی حەج وسـەردانی (بیـت الحـرام) بـکەن تەنها لەسەر ئەوانە فەرزە کە توانـای (دارایـی وتەندروسـتیان) هەیە، جـا ئەوەی کە باوەڕی نەهێناوە، ئەوە با بزانێت بەڕاستی خودا بێ نیازە لە هەموو خەڵکی (پێویستی بە چـاکە وپەرسـتنی کەس نیـیە)} [آل عمـران:٩٧]. لە حەجـدا هەمـوو حـاجیە مسوڵمانەکان کۆ دەبنەوە لە یەک شوێندا بە دڵسـۆزیەوە پەرسـتن بـۆ پەروەردگـار -سبحانە وتعـالى- ئەنجامـدەدەن وهەمـوو حاجیەکـان دروشـمەکانی حەج جێبەجـێ دەکەن بەهەمان شێوە ویەک چۆنیەتی بۆیە لەم شوێنە پیررۆزەدا هـیچ جیـاوازییەکی ژینگەیی ورەچەڵەکی ورۆشنبیری وئاستی بژێوی ژیان نامێنێت.

## ٢٤. مەزنـترین تایبەتمەنـدی پەرسـتنەکان لە ئیسـلامدا ئەوەیە کە چۆنیەتی وکاتی ئەنجامـدان ومەرجەکانیـان خـوای گەورە لە شـەریعەتدا فەرمانی پێکردووە وپێغەمبەریش -صلى الله عليه وسلم- گەیانـدوویەتی، ومرۆڤ بە هیچ شێوەیەک دەسـتکاری وگۆڕانکـاری تێـدا نەکـردووە نە بە زیاد کردن ونە بە کەمکـردن هەتـاوەکو ئەمـڕۆش، وهەمـوو ئەم پەرسـتنە مەزنانە هەموو پێغەمبەران -عليهم السلام- بانگەوازییان بۆ کردووە.

مەزنترین تایبەتمەندی پەرستنەکان لە ئیسلامدا ئەوەیە کە چـۆنیەتی وکـاتی ئەنجامــدان ومەرجەکانیــان خــوای گەورە لە شــەریعەتدا فەرمــانی پێکــردووە وپێغەمبەریش -صلى الله عليه وسلم- گەیانـدوویەتی، ومـرۆڤ بە هـیچ شـێوەیەک دەستکاری وگۆڕانکاری تێدا نەکردووە نە بە زیاد کردن ونە بە کەمکـردن هەتـاوەکو ئەمڕۆش، خوای گەورە دەفەرموێت: {ٱلۡيَـوۡمَ أَكۡمَلۡـتُ لَكُـمۡ دِينَـكُمۡ وَأَتۡمَمۡـتُ عَلَـيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا} واتە: {ئەمڕۆ ئایینەکەتانم بۆ تەواو (کامڵ) کـردووە وچاکە ونیعمەتی خۆم بە تەواوی ڕشتووە بەسەرتاندا ورازی بووم کە ئیسلام ئاینتـان بێت} [المائدة:٣]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {فَٱسۡتَمۡسِكۡ بِٱلَّـذِيٓ أُوحِـيَ إِلَيۡـكَۖ إِنَّـكَ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ} واتە: {کەواتە دەست بگرە بەو قورئانەوەی بۆت نێردراوە بەڕاستی تۆ لەسەر ڕێبازێکی ڕاستیت} [الزخرف:٤٣]. وخوای گەورە سـەبارەت بە نـوێژکردن دەفەرموێت: {فَإِذَا قَضَيْتُمُ الصَّـلَاةَ فَـاذْكُرُوا اللَّهَ قِيَامًـا وَقُعُـودًا وَعَـلَىٰ جُنُـوبِكُمْ ۚ فَـإِذَا اطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ ۚ إِنَّ الصَّلَاةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًـا مَّوْقُوتًـا} واتە: {ئینجـا کاتێک نوێژەکانتان ئەنجامدا یادی خوا بکەن بە وەستانەوە و بە دانیشتنەوە و لەسەر تەنیشتتان (بە پاڵکەوتنەوە) جا هەر کاتێـک دڵ ئـارام بـوون (و ترسـتان نەمـا) ئەو کاتە نوێژەکانتان بە ڕێک و پێکی بکەن بەڕاستی نـوێژ هەمیشـە لەسـەر بـاوەڕداران

فەرز کراوێکی کات بۆ دیـاریکراوە} [النسـاء:١٠٣]. وسـەبارەت بە ئەو چینـانەی کە زەکاتیان پێدەدرێت، خوای گەورە دەفەرموێـت: {إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ} واتە: {بەڕاستی زەکاتدان تەنها (بۆ ئەم کۆمەڵانەیە کە خوای گەورە باسی کردوون) ئەوانیش بـۆ بـێ نەوایـان -ئەوانەی هـیچ شـتێکیان دەسـتناکەوێت- وبـۆ هەژاران -ئەوانەی هەیـانە بەڵام بە پێـی پێویسـتی نیـیە- وبـۆ کرێکارانێک کە زەکات کۆ دەکەنەوە و ئەوانەی دڵیان دادەهێنرێت (بۆ خۆشویسـتنی ئیسـلام) و بـۆ ئـازاد کردنـی بەنـدە وکۆیلەکـان و بـۆ قەرزاران و بـۆ موجاهیـدان وتێکۆشـەران لە پێنـاوی خـودا و بـۆ ڕێبـوارانی پەکـکەوتە ئەمە پێویسـت کـراوە وفەرزکراوە لەلایەن خواوە، و خوا زانـا و کاردروسـتە} [التوبـة:٦٠]. وخـوای گەورە سەبارەت بە ڕۆژووگرتن دەفەرموێت: { شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٖ مِّنَ ٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡفُرۡقَانِۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ وَلِتُكۡمِلُواْ ٱلۡعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمۡ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ} واتە: {مـانگی ڕەمەزان مانگێکە قورئانی تێدا نێردراوەتە خوارەوە بە ڕێنما بۆخەڵکی وبەڵگە گەلێکی ڕۆشن بۆ ڕێنمـوونی و جیـاکردنەوەی (دروسـت ونادروسـت) ئینجـا هەرکەسـێک لە ئێـوە مانگی ڕەمەزانی بینی (باڵغ بوو وتەندروستی باش بوو وموسافیر نەبوو) بـا بەڕۆژوو بێت و هەرکەسێک نەخـۆش بـوو یـان لە سـەفەردا بـوو بـا بە ئەنـدازەی ئەو ڕۆژانە قەزای بکاتەوە لە چەند ڕۆژێکی تردا خوا ئاسانی بۆ ئێـوە دەوێـت، و گرانـی ناوێـت بۆتان (قەزای ڕەمەزانتان لەسـەر دانـرا) تـا مـانگەکە (بگـرن) بەتەواوی و بە گەورە ناوی خوا بەرن لەسـەر ئەو ڕێنمـونیەی کە کردوونـی وتـا سوپاسـی (خـوا) بـکەن} [البقرة:١٨٥]. وخوای گەورە سەبارەت بە حەج دەفەرموێت: {ٱلۡحَجُّ أَشۡهُرٞ مَّعۡلُومَٰتٞ

فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلۡحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي ٱلۡحَجِّ وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ يَعۡلَمۡهُ ٱللَّهُ وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيۡرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقۡوَىٰ وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ} واته:{(كاتى) حەج لە چەند مانگێكى دیاری كراودایە ئەمجا هەركەسێک لەم مانگانەدا حەجی لەسەر خۆی پێویست كرد با ئیتر نەچێتە لای خێزانی و بەدكاری نەكات و دەمەقاڵێ نەكات لە حەجدا و هەرچی بكەن لە چاكە خوا پێی دەزانێت وتوێشووی (پارێزكاری) ولە خواترسان هەڵبگرن كە باشترین توێشوو لە خوا ترسانە ولە من بترسن ئەی هۆشمەندان} [البقرة:١٩٧]. وهەموو ئەم پەرستنە مەزنانە سەرجەم پێغەمبەران بانگەشەیان بۆ ئەنجامدانیان كردووە -علیهم الصلاة والسلام-.

٢٥. پێغەمبەری ئیسلام ناوی موحەممەدی كوڕی عبداللەیە لە نەوەی ئیسماعیل كوڕی ئیبراهیمە -علیهم السلام- لە شاری مەككە لە ساڵی ٥٧١ز لە دایكبووە، ولە مەككە وەحی بۆ نێردرا وبوو بە پێغەمبەر، ولە پاشان كۆچی كرد بۆ مەدینە وبە هیچ شێوەیەک لە شێوەكان بەشداری قەومەكەی نەبوو لە بت پەرستی وكارەكانی سەردەمی جاهیلیەت، تەنها لە كردەوە باشەكان بەشداریان بوو، وهەر لەسەر ڕەوشتی مەزن بوو پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر، وقەومەكەی بە (صادق الأمین) واتە (ڕاستگۆی دەستپاک) ناویان دەبرد، وخوای گەورە لە تەمەنی چل ساڵیدا وەحی بۆی نارد وبوو بە پێغەمبەر وپشتیوانی لێی كرد ویارمەتی دا ئەویش بە بەخشینی چەندەها ئایەت ونیشانە وموعجیزە ولە مەزنترینیان قورئانی پیرۆزە كە مەزنترین ئایەت وموعجیزەی پێغەمبەرانە وموعجیزەیەكە كە

**هەتاوەکو ئەمڕۆ ماوەتەوە، وکاتێک خوای گەورە ئاینەکەی بۆ کامڵ کرد وپێغەمبەر -صلی اللە علیە وسلم- ئاینەکەی وەکو خۆی بە کاملی وجوانی گەیاند لە تەمەنی شەست وسێ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد ولە شاری مەدینە لە گۆڕ دانرا، وپێغەمبەر موحەمەد -صلی اللە علیە وسلم- کۆتا پێغەمبەرە کە خوای گەورە ناردی بە هیدایەت ورۆشنایی وئاینی هەق بۆ ئەوەی خەڵکی دەربهێنێت لە تاریکایی کوفر وبت پەرستی ونەزانین بۆ ڕۆشنایی ونوری تەوحید (یەکخواپەرستی) وئیمان، وخوای گەورە شاهێدی بۆ داوە کە ناردوویەتی بۆ بانگەوازی کردن بۆ لای خوای گەورە بە ئیزنی ئەو زاتە مەزنە.**

خوای گەورە بە خاوەن ڕەوشتی مەزن وەسفی پێغەمبەری کردووە -صلی اللە علیە وسلم-، خوای گەورە سەبارەتی دەفەرموێت: {وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ } واتە:{و بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت وخویەکی ئێجگار بەرز وگەورەیت} [القلم:٤]. وکاتێک گەیشت بە تەمەنی چل ساڵی خوای گەورە پشتیوانی کرد وسەری خست ئەمیش بە پێبەخشینی ئایەت وبەڵگە ونیشانە وموعجیزە مەزنەکان، ومەزنترین موعجیزە قورئانی پیرۆزە، پێغەمبەر -صلی اللە علیە وسلم- دەفەرموێت: «مَا مِنَ الأَنْبِيَاءِ نَبِيٌّ إِلَّا أُعْطِيَ مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْهِ البَشَرُ وَإِنَّمَا كَانَ الَّذِي أُوتِيتُ وَحْيًا أَوْحَاهُ اللَّهُ إِلَيَّ فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ تَابِعًا يَوْمَ القِيَامَةِ» واتە: «هەموو پێغەمبەرێک موعجیزەی پێ بەخشراوە بۆ ئەوەی خەڵکی باوەڕی پێ بهێنێت، بەڵام ئەوەی بە من بەخشراوە* وەحیە لە لایەن خوداوە بۆیە هیوام ئەوەیە کە زۆرترین شوێنکەوتووم هەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا» *(مەبەست قورئانی پیرۆزە کە گەورەترین موعجیزەیە) [صحیح البخاري]. وقورئانی پیرۆز بریتیە لە وەحی (سروشی) خودا بۆ پێغەمبەرەکەی -صلی

الله علـيه وسـلم-، خـوای گەورە سـەبارەت بە قورئـانی پیـرۆز دەفەرموێـت: {ذَٰلِـكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ۛ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ} واتە: {ئەم قورئانە هـیچ گومـانێکی تێـدا نیـیە (کـە لەلایـەن خوای گـەورەوە نـێـردراوە) ڕێنیشاندەری پارێزکـار و لە خـوا ترسـانە (پارێزکاران ولە خـوا ترسـان بە زانسـت وزانیـاری بەسـوود وکـار وکـردەوەی چـاکە پێدەکەن وسوودی لێوەردەگرن، چونکە ئەوانـن لە پەروەردگاریـان دەترسـن وشـوێن فەرمان ورێنمایەکـانی دەکەون)} [البقـرة:٢]. وهەروەهـا خـوای گەورە سـەبارەت بە قورئانی پیرۆز لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: {أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا} واتە: {ئەوە بۆ بیر ناکەنەوە لە قورئان؟ خۆ ئەگەر لەلایەن کەسێکی ترەوە بووایە جگە لە خوا بێگومان دەیانبینی تیایدا جیاوازیی زۆر} [النسـاء:٨٢]. خـوای گەورە بەرەنگـاری مـرۆڤ وجنـۆکە بـووەوە بەوەی کە ئەگەر دەتوانن با کتێبێک وەکو قورئانی پیرۆز بهێنن، خـوای گەورە دەفەرموێـت: {قُـل لَّـئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَىٰ أَن يَأْتُوا بِمِثْلِ هَٰذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُـهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا} واتە: {(ئەی موحەممەد -صلى الله عليه وسـلم-) بڵـێ سـوێند بە خـوا ئەگەر ئادەمی و جنۆکە هەموو کۆببنەوە بۆ ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بهێـنن نـاتوانن وێـنەی بهێـنن هەرچەنـدە پشـتیوانی یەکـتریش بـن} [الإسراء:٨٨]. وخـوای گەورە بەرەنگاریان بووە بەوەی کە ئەگەر دەتوانن با دە سـورەت وەکـو سـورەتەکانی قورئـانی پیرۆز بهێنن، خوای گەورە دەفەرموێت: {أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا بِعَشْرِ سُـوَرٍ مِّثْلِـهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ} واتە: {یان ئەوانە دەڵێن پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- ئەو (قورئانە)ی هەڵبەسـتووە بڵـێ دەی ئێـوەش دە سورەتی وەکو ئەو (قورئانە) بهێنن هەڵبەستراو بـن وبانـگ بـکەن (لە پشـتیوانیتان) هەرکەس دەتوانن بێجگە لە خوا ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن} [هود:١٣]. بەڵکو خـوای گەورە بەرەنگاریان بووەوە بەوەی کە ئەگەر دەتوانن با تەنانەت یەک سورەتیش بێـت

وەکو سورەتەکانی قورئانی پیـرۆز بیهێـنن، خـوای گەورە دەفەرموێـت: {وَإِن كُنـتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ} واتە: {وئەگەر ئێوە لەگومان دان لەم (قورئانەی) کەناردومانەتە خوارەوە بـۆ بەنـــدەی خۆمـــان(موحەممەد ) دەی ســـورەتێک بهێـــنن بە وێـــنەی ئەو وبـــانگی هاوکارەکانتان بکەن (لە ڕەوانبێژان وشاعیران) بێجگە لە خـوا ئەگەر ڕاسـت دەکەن (وبە فەرموودەی خوای نازانن)} [البقرة:٢٣].

وقورئانی پیرۆز تاکە ئایەت ونیشانە وموعجیزەیە کە مـاوەتەوە لە مـوعجیزە وئایەتەکانی پێغەمبەران هەتاوەکو ئەمڕۆ، وکاتێک خوای گەورە ئەم ئاینەی کامڵ کرد بۆ پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- وبە ئەوپەڕی جوانی وکاملی ئاینەکەی گەیانـد؛ پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- لە تەمەنی شەست وسێ ساڵیدا کۆچی دوایی کـرد ولە شاری مەدینە لە گۆڕ دانرا. وپێغەمبەر موحەمەد -صلى الله علـيە وسـلم- کۆتـا پێغەمبەر -نبي- وکۆتا نێردراوە -رسول-ە، خوای گەورە دەفەرموێت: {مَّا كَـانَ مُحَمَّـدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّـينَ وَكَـانَ اللَّهُ بِكُـلِّ شَيْءٍ عَلِـيمًا} واتە: {موحەممەد -صلى الـله علـيە وسـلم- بـاوکی هـیچ یەك لە پیاوانتـان نیـیە (نە زەیدی کوڕی حاریثە و نە هیچ کەسێکی تر) بەڵکو ئەو نێردراوی خوا و کۆتاهەمینی پێغەمبەرانە و خوا بە هەموو شتێك زانایە} [الأحزاب:٤٠]. لە ئەبی هـورەیرەوە -ڕەزای خوای لێبێت- کە پێغەمبەری خودا -صلى الله علـيە وسـلم- دەفەرموێـت: «إِنَّ مَـثَلِي وَمَثَلَ الأَنْبِيَاءِ مِنْ قَبْلِي كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى بَيْتًا فَأَحْسَنَهُ وَأَجْمَلَهُ إِلَّا مَوْضِعَ لَبِنَةٍ مِنْ زَاوِيَةٍ فَجَعَلَ النَّاسُ يَطُوفُونَ بِهِ وَيَعْجَبُونَ لَهُ وَيَقُولُونَ هَلَّا وُضِعَتْ هَـذِهِ اللَّبِنَـةُ؟ قَـالَ: فَأَنَـا اللَّبِنَةُ وَأَنَا خَاتِمُ النَّبِيِّينَ» واتە: «نمونەی من وپێغەمبەرانی پـێش مـن وەکـو نمـونەی پیاوێکە خانوویەکی بە جـوانی دروسـتکردبێت تەنهـا شـوێنی خشـتێکی مابێـت لە گۆشەیەکدا، وخەڵکی بە دەورووپشتی خانووەکەدا بسوڕێنەوە وبە لایانەوە جوان بێت

ودەڵێن: خۆزگایە ئەو خشتە دابنرێت؟ -صلى الله علـيه وسـلم-فەرمـووی:«مـن ئەو خشتەم ومن کۆتا پێغەمبەرم». [صحيح البخاري]. ولە ئینجیلدا مەسـیح (عیسـا) -عليه السلام- موژدەی داوە بە هاتنی پێغەمبەر موحەمەد -صـلى الـله علـيه وسـلم-: (ئایا هەرگیز نەتانخوێندووەتەوە لە پەڕە تۆمارکراوەکاندا -کتێبەکـانی پێشـوودا- : ئەو بەردەی کە هەموو بنیاتکەرەکان ڕەتیان کـردەوە؛ ئێسـتا بـووە بە بەردی سـەرەکی لە گۆشەکەدا، ئەمە کردەوەی پەروەردگارە وسەیرە لە چاوی ئێمەوە -بە لای ئێمەوە-).

لەو تەوراتەی کە لە ئەمڕۆدا هەیە وتەیەکی تێدایە کە خودا بە موسـا -علیـه السلام- دەفەرموێت: (پێغەمبەرێک بەرز دەکەمەوە لە نێـو براکانیـان، وەکـو تـۆیە و وتەی خۆم دەکەمە نێو دەمی، بۆیە هەموو شتێک دەگەیەنێت کە من بۆی دەنێـرم -بە وەحی-). وپێغەمـبەر مـوحەمەد -صـلى الـله علـيه وسـلم- خـوای گەورە نـاردی بە هیدایەت وئاینی هەق وشاهێدی بـۆی داوە کە لەسـەر هەقە وبە ئیزنـی خـودا وەکـو پێغەمبەر وبانگخواز نێردراوە بۆ ئەوەی خەڵکی بانگ بکـات بـۆ لای خـوای گەورە، خوای گەورە دەفەرموێت: {لَّٰكِنِ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْـكَ أَنزَلَـهُ بِعِلْمِـهِ وَالْمَلَائِكَـةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَـهِيدًا} واتە: {بەڵام خـوا شـاهێدی دەدات لەسـەر ئەوەی ئەو قورئـانەی نـاردوویەتیە خـوارەوە بـۆت بە زانینـی خـۆی نـاردوویەتیە خـوارەوە و فریشتەکانیش شاهێدی دەدەن خوا بەسە کە شـاهێد بێـت} [النسـاء:١٦٦]. وخـوای گەورە دەفەرموێت: {هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَـقِّ لِيُظْهِـرَهُ عَـلَى الـدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَـىٰ بِـاللَّهِ شَـهِيدًا} واتە: {خـوا ئەو زاتەیە کە پێغەمـبەری خـۆی نـاردووە بە ڕێنموونیی وئاینێکی ڕاست ودروستەوە، هەتا بەسەر هەموو ئاینێکدا سـەری بخـات هەرچەندە هاوبەش پەیداکەرانیش (موشریکانیش) پێیان ناخۆش بێت} [الفتح:٢٨]. خوای گەورە بە هیدایەت نـاردی بـۆ ئەوەی خەڵکـی دەربهێنێـت لە تاریکـایی بـت پەرستی وکوفر ونەزانین وجەهالەت وخوڕافیات بۆ نور ورۆشـنایی تەوحیـد وئـیمان

(باوەڕ)، خوای گەورە دەفەرموێت: {يَهْـدِي بِـهِ اللَّهُ مَـنِ اتَّبَـعَ رِضْـوَانَهُ سُـبُلَ السَّـلَامِ وَيُخْرِجُهُم مِّـنَ الظُّلُـمَاتِ إِلَى النُّـورِ بِإِذْنِـهِ وَيَهْـدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْـتَقِيمٍ} واتە: {خـوا ڕێنمونی کەسێکی پێدەکات شوێن ڕەزامەندی ئەو بکەوێت بۆ ڕێگەکـانی ئـارامی و ئاشتی و دەریان دەهێنێـت لەتاریکیەکـانی (کـوفر وبێبـاوەڕیەوە) بـۆ نـاو ڕوونـاکی (ئـیمان و ئیسـلام) بە فەرمـانی خـۆی وڕێنمونیـان دەکـات بـۆ ڕێگـای ڕاسـت} [المائدة:١٦]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {الر كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّـاسَ مِـنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِـمْ إِلَىٰ صِرَاطِ الْعَزِيـزِ الْحَمِيـدِ } واتە: {بە (ئەلیـف لام ڕا) دەخوێنرێتەوە خوا زاناترە بە ماناکەی، ئەمە کتێبکە ناردومانەتە خوارەوە بۆ تـۆ (ئەی مـوحەممەد -صـلی الـله علـیه وسـلم-) بـۆ ئەوەی خەڵکـی ڕزگـار بکەیـت لەتاریکیەکانەوە بۆ ڕووناکی (لەتاریکی بێباوەڕیەوە بۆ ڕوونـاکی بـاوەڕ وئـیمان) بە ئیزنی پەروەردگاریان (ڕێنمونیان بکەیت) بۆ ڕێگای (خوای) بە دەسەڵات وشـکۆدار و سوپاس کراو} [إبراهيم:١].

**٢٦. وشەریعەتی ئیسلام کە موحەمەد -صلی الله علیه وسلم- پێی هاتووە کۆتا پەیام وشەریعەتی خودایە، وشەریعەتێکە لە ئەوپەڕی کامڵیدایە لە هەموو ڕوانگەیەکەوە، وهۆکاری چاکبوونی دینداری ودونیای خەڵکیە، وبە پلەی یەکەم پارێزگاری دەکات لە: ئاینی خەڵکی، وخوێنیان (نەفسیان)، وسامانیان، وئەقڵیان ونەوەکانیان، وئاین وشەریعەتی ئیسلام هەڵوەشێنەرەوەی هەموو ئاین وشەریعەتەکانی پێشووە (واتە: نابێت چیتر شەریعەت وئاینەکانی پێشووتر پەیڕەو وکردەوەیان پێبکرێت)؛ هەروەکو چۆن شەریعەت وئاینەکانی پێشووتر یەکتریان هەڵوەشاندنەوە لە ڕوانگەی پەیڕەو کردن وکردەوە پێکردن.**

شەریعەتی ئیسلام کە پێغەمبەر موحەمەد -صلی الله علیه وسلم- پێی هاتووە؛ دواین پەیام وشەریعەتی خودایە، وخوای گەورە بەم پەیامە ئاینی کامڵ کرد ونیعمەتی خۆی ڕژاند بەسەر خەڵکیدا ئەمیش بە ناردنی پێغەمبەر موحەمەد -صلی الله علیه وسلم-، خوای گەورە دەفەرموێت: {الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا} واتە: {ئەمڕۆ ئایینەکەتانم تەواو (کامڵ) کردووە بۆتان و چاکە وبەهرە ونیعمەتی خۆم بە تەواوی ڕشتووە بەسەرتاندا و ڕازی بووم کە ئیسلام ئاینتان بێت} [المائدة:٣]. وشەریعەتی ئیسلام لە ئەوپەڕی کامڵیدایە وهۆکاری چاکبوونی دینداری خەڵکی ودونیایانە، چونکە هەموو ئەو شتانەی تێدایە کە لە شەریعەتەکانی پێشوودا هەبوو وتەواو وکامڵی کردن، خوای گەورە دەفەرموێت: {إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا} واتە: {بەڕاستی ئەم قورئانە ڕێنمونی دەکات بۆ ڕێباز و بەرنامەیەک کە ڕاسترینە و موژدەش دەدات بەو باوەڕدارانەی کە کردەوە چاکەکان دەکەن کە

بەڕاستی پاداشـتی گەورەیـان بـۆ هەیە} [الإسراء:٩]. وشـەریعەتی ئیسـلام هـات بە لابردن وهەڵوەشاندنەوەی ئەو قورسـی ونارەحەتیـانەی کە لەسـەر ئومەتـانی پێشـوو هەبوو، خوای گەورە دەفەرموێت: {الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَـهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُـمْ وَالْأَغْـلَالَ الَّتِـي كَانَـتْ عَلَـيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنزِلَ مَعَهُ أُولَٰئِكَ هُـمُ الْمُفْلِحُـونَ} واتە: {(ئەم ڕەحمەتەی پەروەردگار) بۆ ئەوانەیە کە شوێن (پێغەمبەر -صلى الله عليـه وسلم-) دەکەون کە پێغەمبەرێکی نەخوێندەوارە و (لەلایەن پەروەردگـارەوە هـاتووە) ئەو کەسە (پێغەمبەرێکە ئەهلی کتێب سیفەتەکانی دەزانـن ودەیناسـن) چـونکە بە نـووسراوی لایـانە لە تەورات و ئینجیلـدا کە فەرمانیـان پـێ دەکـات بە چـاکە و ڕێگرییان لێ دەکات لە خراپە وشتە پاکەکانیان بۆ حەڵاڵ دەکات وشتە پیسـەکانیان لێ حەرام (قەدەغە) دەکات و بـارە قـورس وگرانەکـان وئەو کـۆت و زنجیـرانەش کە بەسـەریانەوە بـوون لەسـەریان لای دەبـات ئەمجـا ئەو کەسـانەی کە باوەڕیـان بەو (پێغەمبەرە) هێنابێت و ڕێزو قەدریان بۆ دانابێت یارمەتیان دابێت و پشتیوانیان لـێ کردبێـت و پەیـڕەوی ئەو نوورەیـان کردبێـت (کە قورئـانە) کە لەگەڵیـدا نێـردراوەتە خوارەوە ئەوان هەموو (کە باسکران) لە ڕزگار بووانن} [الأعـراف:١٥٧]. شـەریعەتی ئیسلام هەڵوەشێنەرەوەی شەریعەتەکانی پێشووی ئاینی پێغەمبەرانـی پێشـووە (واتـا: نابێت چیتر کردەوەیان پێبکرێت)، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَـابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ فَـاحْكُم بَيْـنَهُم بِمَـا أَنـزَلَ اللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًـا وَلَـوْ شَـاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِـدَةً وَلَٰكِـن لِّيَبْلُـوَكُمْ فِي مَـا آتَـاكُمْ فَاسْـتَبِقُوا الْخَـيْرَاتِ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّـئُكُم بِمَـا كُنـتُمْ فِيـهِ تَخْتَلِفُـونَ } واتە: {وئەم قورئانەمـان نـاردە

خوارەوە بۆ تۆ بە هەق وڕاستی وکتێبەکانی پێش خۆی بە ڕاست دەزانێت وپشتیوانیان لێـدەکات (پـێش دەسـت تێخسـتن وگۆڕینیـان لەلایەن جـولەکە وگاورەکـانەوە) وچاودێریانە کەواتە حوکم وبڕیار بدە لەناو نامەدارەکانـدا بەوەی خـودا نـاردوویەتیە خوارەوە, وشوێن هەوا وئارەزووی ئەوان مەکەوە لانەدەیـت لەو حـوکم و بڕیـارە هەق وڕاسـتەی کە بـۆت هـاتووە دامـان نـاوە بـۆ هەر ئوممەتێـک لە ئێـوە شـەریعەت ورێگەیەکی ڕوون وئەگەر خودا بیویستایە ئێوەی ئەکـرد بەیەک ئـوممەت وکـۆمەڵ بەڵام (نەیکردوون) بۆ ئەوەی تاقیتان بکـاتەوە لەو شـەریعەت وياسـايانەی کە پێـی بەخشیوون کەواتە پێشبڕکێ بکەن بۆ ئەو شـتانەی کە چـاکن گەڕانەوەتـان هەر بـۆ لای خودایە بە گشتی ئەمجا هەواڵتان پێدەدا سـەبارەت بەوەی کە لە ژیـانی دونیـادا تێیـدا جیـاواز ونـاکۆک بـوون} [المائـدة:٤٨]. قورئـانی پیـرۆز کە شەریعەتیشـی لە خۆگرتووە وەکو بەڕاستدانانێک بۆ کتێبەکانی خودا هاتووە لە پێشوودا، وفەرمانڕەوایە بەسەریانەوە، وهەڵوەشێنەرەوەیانەوە (واتە نابێت چیتر حـوکم بەو پەيامـانەی پێشـوو بکرێت وەکو: تەورات وئینجیل وجگە لە ئەمانە)

**٢٧. له ڕۆژی قیامەتدا؛ خوای گەورە -سبحانه وتعالى- هیچ ئاینێک قبوڵ ناکات جگە لە ئاینی ئیسلام، ئەو ئیسلامەی کە موحەمەد -صلى الله عليه وسلم- پێی هاتووە، وهەرکەسێک شوێنی ئاین وبەرنامەیەکی تر بکەوێت جگە لە ئیسلام ئەوا لێی قبوڵ ناکرێت ولە دۆڕاوەکان دەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا.**

خوای گەورە -سبحانه وتعالى- پاش ئەوەی موحەمەدی نارد وەکو پێغەمبەرێک -صلى الله عليه وسلم-؛ هیچ ئاینێکی تر قبوڵ ناکات لە ڕۆژی قیامەتدا جگە لە ئاینی ئیسلام، ئەو ئیسلامەی کە موحەمەد -صلى الله عليه وسلم- پێی هاتووە، وهەرکەسێک شوێنی ئاین وبەرنامەیەکی تر بکەوێت جگە لە ئیسلام ئەوا لێی قبوڵ ناکرێت ولە دۆڕاوەکان دەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا. خوای گەورە دەفەرموێت: {وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ} واتە: {هەرکەسێک جگە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەر ئاینێکی تر هەڵبژێرێت ئەوا خوای گەورە لێی وەرناگرێت} [آل عمران:٨٥]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ وَمَا اخْتَلَفَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ وَمَن يَكْفُرْ بِآيَاتِ اللَّهِ فَإِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ} واتە: { بەڕاستی دینی پەسەندکراو لای خوا (هەر) ئیسلامە دوو بەرەکی نەکەوتە نێوان ئەوانەی کە پەیامیان بۆ هاتبوو مەگەر دوای ئەوە نەبێت کە زانستی ڕاست وتەواویان بۆ هات (ئەم لادانەشیان) لە ڕوانگەی ستەم و حەسوودیەوە بوو لە نێو خۆیاندا جا هەر کەسێک بێباوەڕ بێت بە ئایەتەکانی خوا (کە قورئانە) ئەوا بەڕاستی خوا زوو حسێبی لەگەڵ دەکات} [آل عمران:١٩]. وئاینی ئیسلام ئاینی پێغەمبەر ئیبراهیمی خەلیلی خودا بووە -عليه السلام-، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلَّا

مَن سَفِهَ نَفْسَهُ  وَلَقَدِ اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا  وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ } واته: {کێ ڕوو وەردەگێڕێت لە ئایینی ئیبراهیم -علیه السلام-؟ مەگەر کەسێک کە خۆی گێل ونەفام کردبێت؟ سوێند بێت بێگومان ئیبراهیممان هەڵبژارد لە دونیادا وبێگومان ئەو لە ڕۆژی دواییدا لە چاکەکارانە} [البقرة:١٣٠]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَاتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا  وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلًا} واته: {ئایا کێ ئایینی چاکتر و جوانترە (وکێ دیندارترە) لە کەسێک کە ڕووی خۆی یەکلا کردبێتەوە بۆ خوا لە هەمان کاتدا ئەو کەسە چاکەکار بێت و شوێنی ئاینی ئیبراهیم کەوتبێت بەڕاستی و پاکی (کە بە ویستی خۆی لە بەتاڵی وگومڕایی لای داوە بۆ لای ڕاستی) و خوا ئیبراهیمی هەڵبژارد بە دۆست و خۆشەویستی خۆی} [النساء:١٢٥]. وخوای گەورە فەرمانی کردووە بە پێغەمبەر موحەمەد -صلى الله عليه وسلم- کە بفەرموێت: {قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا  وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ} واته: {(ئەی موحەممەد -صلى الله عليه وسلم-) بڵێ بێگومان من پەروەردگارم ڕێنمونی کردووم بۆ ڕێگای ڕاست ئاینێکی زۆر ڕاست و پاک (کە هیچ لاریەکی تیا نییە) ئایینی ئەو ئیبراهیمەیە کە لە هەموو ئایینە ناڕاستەکان لایداوە بۆ پەرستنی خوا بە تەنها وبە هیچ جۆرێک لە هاوبەش پەیداکەران (موشریکان) نەبووە} [الأنعام:١٦١].

٢٨. قورئانی پیرۆز کتێبی خودایە کە بە وەحی ناردی بـۆ پێغەمـبەر موحەمەد -صلى الله عليه وسـلم- و وتەی خـودای پەروەردگـاری هەمـوو بوونەوەرەکانە، وخودا ڕکابەرایەتی مرۆڤ وجنۆکەکـانی کـرد کە کتێبێـک بهێنن وەکو قورئانی پیـرۆز وڕکـابەرایەتیەکە بەردەوامە هەتـاوەکو ئەمـڕۆ، وقورئـانی پیـرۆز وەڵامـی زۆر پرسـیاری گرنـگ دەداتەوە کە جێگـای سـەرگەردانی وسەرسـوڕمانیە لە لای ملیۆنەهـا مـرۆڤ، وقورئـانی پیـرۆز پارێزراوە هەتاوەکو ئەمڕۆ بەو زمـانەی کە پێـی دابەزیـووە ئەویـش زمـانی عەرەبـیە وتەنـانەت پیتێکیشـی لـێ کەم نەبـووەتەوە وچـاپکراوە وبڵاوکـراوەتەوە، وکتبێکـی مەزنە وپـڕە لە مـوعجیزە ودەبێـت مـرۆڤ بیخـوێنێتەوە یـان واتـا وەرگێڕاوەکـانی بخـوێنێتەوە، وهەروەهـا سـونەتی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- وفەرموودەکانی وفێرکردنەکانی وسـیرەتی پـارێزراوە وگێـڕدراونەتەوە بۆمـان بە پێـی زنجیـرەیەک لە گێـڕەرەوەی متمانەپێکراو ولە چەندەها کتێبدا چاپکراون بە زمانی عەرەبی ئەو زمانەی کە پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- قسەی پێی کردووە و وەرگێڕدراون بـۆ سەر چەندەها زمان لە جیهاندا، وقورئانی پیرۆز وسونەتی پێغەمبەر -صـلى الله عليه وسلم- تاکە سەرچاوەن بۆ ئەحکام ویاساکانی ئاین وشـەریعەتی ئیسلام، ونابێت کردەوەی ئەو تاکانەی کە خۆیان دەدەنە پاڵ ئیسلام وەکـو سـەرچاوە دابـنرێن؛ بەڵکـو تـاکە سـەرچاوە کە دەبێـتە لێـیەوە فێـری

## ئەحکامەکانی ئاینی ئیسلام بین بریتیە لە وەحی خودا: قورئانی پیرۆز وسونەتی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم-.

قورئانی پیرۆز ئەو کتێبەیە کە خودا بە وەحی (سروش) ناردی بۆ پێغەمبەرێک کە لە گەلی عەرەبە ئەویش موحەممەدە -صلى الله عليه وسلم- وبە زمانی عەرەبی، وئەم کتێبە وتەی پەروەردگاری هەموو بوونەوەرەکانە -سبحانه وتعالى- ، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٩٢) و بەڕاستی ئەم (قورئانە) دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانیانە (١٩٢) نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ (١٩٣) جوبرەیلی ئەمین هێنایە خوارەوە (١٩٣) عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ (١٩٤) بۆ سەر دڵی تۆ بۆ ئەوەی لە ترسێنەران بیت (١٩٤) بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ (١٩٥) بەزمانێکی عەرەبی پاراو وڕوون (١٩٥)} [الشعراء:١٩٢-١٩٥]. وخوای گەورە دەفەرموێت: { وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى الْقُرْآنَ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ عَلِيمٍ } واتە: {بەڕاستی تۆ (ئەی موحەممەد -صلى الله عليه وسلم-) قورئانت پێدەدرێ (فێر دەکرێیت) لەلایەن خوای کاردروست و زاناوە} [النمل:٦]. وئەم قورئانە لە لایەن خوداوە نێردراوەتە خوارەوە و بەڕاستدانانی کتێبە ئاسمانیەکانی پێشووە کە خودا ناردوویەتی، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَمَا كَانَ هَٰذَا الْقُرْآنُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ اللَّهِ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ الْكِتَابِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ الْعَالَمِينَ} واتە: {ڕەوا نییە و ناگونجێت کە ئەم قورئانە هەڵبەسترا بێت وقسەی جگە لە خودا نییە (چونکە کەس ناتوانێت قسەی وا بکات جگە لە خودا) بەڵکو بەڕاست دانەری ئەو (کتێبانەی) پێش خۆیەتی (پێش دەستکاری کردنیان) و ڕوونکەرەوەی کتێبە ئاسمانیەکانە (ئەم قورئانە) هیچ گومانی تێدا نییە لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە هاتووە} [یونس:٣٧]. قورئانی پیرۆز زۆربەی ئەو مەسەلانە ڕووندەکاتەوە کە جولەکە وگاوڕەکان سەبارەتی ناکۆک بوون لە ئاینەکەیاندا، خوای گەورە دەفەرموێت: {إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَكْثَرَ الَّذِي هُمْ فِيهِ

يَخْتَلِفُونَ } واتە: {بەڕاستی ئەم قورئانە دەیگێڕێتەوە بۆ نەوەی ئیسرائیل زۆربەی ئەو مەسەلانەی کە ئەوان تێیدا جیاوازن} [النمل:٧٦].

وقورئانی پیرۆز ئەوەندە بەڵگە ونیشانەی ئاشکرا وڕوونی تێدایە کە ببێتە بەڵگە بەسەر خەڵکیەوە بۆ ئەوەی ئەو ڕاستی وهەقیقەتانە بناسن کە پەیوەستە بە خوای گەورەوە -سبحانە وتعالی- وئاینەکەی وپاداشت وسزادانی، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ} واتە: {سوێند بە خودا بەڕاستی لەم قورئانەدا هێناومانەتەوە بۆ خەڵکی هەموو جۆرە نموونەیەك تا پەند وئامۆژگاری لێوەربگرن} [ الزمر:٢٧]. وهەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: {وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ} واتە: {ئێمە قورئانمان ناردووەتە خوارەوە بۆت کە ڕوونکەرەوەیە بۆ هەموو شتێک وڕێنمونی و میهرەبانی و موژدەیە بۆ موسڵمانان} [النحل:٨٩]. وقورئانی پیرۆز وەڵامی هەندێک پرسیار دەداتەوە کە هۆی سەرگەردان بوونی ملیۆنەها مرۆڤن، قورئانی پیرۆز ڕوونی دەکاتەوە کە چۆن خوای گەورە ئاسمانەکان وزەوی دروستکردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: {أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ} واتە: {ئایا نەیان بینی (نەیانزانیووە) ئەوانەی بێباوەڕن کە ئاسمانەکان و زەوی هەردووکیان پێکەوە لکابوون (ویەک پارچە بوون) ئەمجا لە یەکترمان جیاکردنەوە و فەراهەممان هێنا لەئاو ودروستمان کردووە هەموو شتێکی زیندوو دەی ئایا ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن؟} [الأنبیاء:٣٠]. وچۆن خوای گەورە مرۆڤی دروستکرد، خوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم

مَّن يُرَدُّ إِلَىٰ أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِن بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئًا وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ} واته: {ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە لە گوماندان دەربارەی زیندووبوونەوە ئەوسا (بزانن) بەڕاستی ئێمە ئێوەمان دروستکردووە لە خاک (خۆڵ) پاشان (نەوەکان) لە دڵۆپە ئاوێک -نوتفەیەک- (دروست دەبن) دواتر (دەبێتە) پارچە خوێنێکی مەیو دوای ئەوە (دەبێتە) پارچە گۆشتێک شکڵ و شێوە کێشراو و شکڵ و شێوە نەکێشراو بۆ ئەوەی ڕوونی بکەینەوە بۆ ئێوە و لە منداڵداندا دەیهێڵینەوە (ڕایدەگرین) ئەو (بێچووەی) بمانەوێت (لەبار نەچێت) تا کاتێکی دیاریکراو پاشان (لەسکی دایکتان) دەرتان دەهێنین بە ساوایی پاشان گەورە دەبن هەتا دەگەنە تەواوی هێز وتواناتان و (لەم تەمەنەدا) هەندێکتان دەمرێندرێت و هەندێکتان دەگەیەنرێنە ئەو پەڕی پیری، بێ سوودترینی تەمەن بۆ ئەوەی نەزانێت و لەبیری نەمێنێت هەرچی کە دەیزانی و زەوی دەبینی (لەزستاندا) خامۆشە و وشک و بێ گیایە جا کاتێک بارانمان بەسەردا باراند زەوی (ڕووەکی لێ دەڕوێت) ودەجولێت زەوی هەڵدەدات (بەرز دەبێتەوە) و(زەوی) دەڕوێنێ لە هەموو جۆرە (گیا و گوڵێکی) جوان} [الحج: ٥]. وچارەنووسی بەرەو کوێیە وپاداشتی چاکەکار وسزای خراپەکار چییە لە پاش ئەم ژیانە ولە پێشتردا باسی بەڵگەکان کرا سەبارەت بەم بابەتە لە بڕگەی ژمارە (٢٠) وئایا ئەم بوونە بە ڕێکەوتە یان بەدیهێنراوە بۆ مەبەستێکی پیرۆز؟ خوای گەورە دەفەرموێت: { أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ وَأَنْ عَسَىٰ أَن يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ} واتە: {ئایا ئەوانە ناڕوانن؟ لەو موڵکە گەورە وفراوانەی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە ولەو شتانەی خوای گەورە دروستی کردوون ولەوانەیە نزیک بوو بێتەوە کۆتایی (ژیان) یان ئینجا بە چی قسەیەک لە پاش قورئان بڕوا دەهێنن} [الأعراف:١٨٥]. وهەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: { أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا

وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ } واتە: {ئایا ئێوە گومانتان وا بووە کە بێگومان ئێوەمان بە بێ هۆ (بۆ یاری وگاڵتە وگەپ) دروستکردووە، و (وا گومانتان دەبرد) بێگومان ئێوە ناگەڕێنەوە بۆلای ئێمە؟} [المؤمنون:١١٥]. وقورئانی پیرۆز پارێزراوە هەتا ئەمڕۆ بەو زمانەی کە دابەزێندراوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾واتە: ﴿بێگومان هەر ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە وبەڕاستی هەر ئێمەش دەیپارێزین﴾ [الحجر : ٩]. تەنانەت یەک پیتیشی لێی کەم نەکراوە وبۆی زیاد نەکراوە، ومەحاڵە کە دژیەکی تێدا بێت یان شتێکی لێ کەم بکرێتەوە یان شتێکی بۆ زیاد بکرێت یان بگۆردرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: {أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا} واتە: {ئەوە بۆ بیر ناکەنەوە لە قورئان؟ خۆ ئەگەر لەلایەن کەسێکی ترەوە بووایە جگە لە خوا بێگومان دەیانبینی تیایدا جیاوازیی زۆر} [النساء:٨٢].

وقورئانی پیرۆز چاپکراوە وبڵاوکراوەتەوە، وکتبێکی مەزنە وپڕە لە موعجیزە ودەبێت مرۆڤ بیخوێنێتەوە و گوێی لێبگرێت یان واتا وەرگێڕاوەکانی بخوێنێتەوە، وهەروەها سونەتی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- وفەرموودەکانی وفێرکردنەکانی وسیرەتی پارێزراوە وگێڕدراوەتەوە بۆمان بە پێی زنجیرەیەک لە گێڕەرەوەی متمانەپێکراو ولە چەندەها کتێبدا چاپکراون بە زمانی عەرەبی ئەو زمانەی کە پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- قسەی پێی کردووە و وەرگێڕدراون بۆ سەر چەندەها زمان لە جیهاندا، وقورئانی پیرۆز وسونەتی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- تاکە سەرچاوەن بۆ ئەحکام ویاساکانی ئاین وشەریعەتی ئیسلام، ونابێت کردەوەی ئەو تاکانەی کە خۆیان دەدەنە پاڵ ئیسلام وەکو سەرچاوە دابنرێن؛ بەڵکو تاکە سەرچاوە کە دەبێتە لێیەوە فێری ئەحکامەکانی ئاینی ئیسلام بین بریتیە لە وەحی خودا: قورئانی پیرۆز وسونەتی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم-، خوای گەورە

سەبارەت بە قورئانی پیرۆز دەفەرموێـت: { إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلذِّكۡرِ لَمَّا جَآءَهُمۡ وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٞ (٤١) لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ (٤٢)} واتە: { بەڕاستی ئەوانەی کە قورئانیان بـۆ هـات وباوەڕیـان پێنەهێنـا (سـزایان دەدەین) کە بەڕاستی کتێبێکی زۆر بەرز وجێگەی ڕێزە (٤١) بەتاڵ وناڕاسـتی ڕووی تێناکات نە لە ئێستا ونە لە داهاتوودا (گۆڕانکـاری بەسـەریدا ڕوونـادات: نە بە لـێ کەمکـردن ونە بە زیـادکردن) چـونکە نێـردراوەتە خـوارەوە لەلایەن (خـودای) کاردروست و ستایشکراوەوە (٤٢)} [فصلت:٤١-٤٢]. وسونەتی پێغەمبەر -صـلی الـلە علیە وسلم- وەحیە (سروشە) لە لایەن خوداوە، خـوای گەورە سـەبارەت بە سـونەت دەفەرموێت: {وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ} واتە: {وئەوەی پێغەمبەر -صلی اللە علیە وسـلم- پێـی دان (فەرمـانی پێکردن) وەریبگرن (جێبەجێی بکەن) وئەوەی لێتانی قەدەغەکـرد وازی لـێ بهێـنن (ئەنجـامی مەدەن) ولە خـودا بترسـن بێگومـان خـوای گەورە سـزای سـەختە} [الحشر:٧].

## ٢٩. وئاینی ئیسلام فەرمان دەکات بە چاکەکار بوون بەرامبەر دایک وباوک، ئەگەرچـیش مسـوڵمان نەبـن، وئامۆژگـاری کـردووە بە پەروەردە کردن وئامۆژگاریکردنی منداڵان.

ئاینی ئیسلام فەرماندەکات بە چاکەکـاری بەرامـبەر دایـک وبـاوک، خـوای گەورە دەفەرموێت: {وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا} واتە: {وپەروەردگارت بڕیاریداوە کە هـیچ کەس وشـتێک نەپەرسـتن جـگە لە ئەو و

لەگەڵ دایک و باوکتان چاکەکار بکەن ئەگەر یەکێکیـان (بـاوک یـان دایـک) یـان هەردووکیان لای تۆ پیربوون قسەی ناخۆشیان پـێ مەڵـێن تەنـانەت ئەگەر ئـۆفیش بێـت وتێیــان مەخــوڕە و پێیانــدا هەڵمەشــاخێ (بەڵکــو) وتەی نەرم و شــیرینیان (لەگەڵدا) بەکاربێنە} [الإسراء:٢٣]. وخوای گەورە دەفەرموێـت: {وَوَصَّـيْنَا الْإِنسَـانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًـا عَـلَىٰ وَهْـنٍ وَفِصَـالُهُ فِي عَـامَيْنِ أَنِ اشْـكُرْ لِي وَلِوَالِـدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِير} واتە: {وفەرمانمان داوە بە ئـادەمی (بە چـاکی هەڵسـوکەوت کـردن لەگەڵ) دايك و باوكيدا دایکی هەڵی دەگرێ بە دووگیانی (پێی لاواز دەبێ) لاوازی لە دوای لاوازی و بڕینەوەی لە شیر لە (دوا تەمەنی) دوو ساڵیەوە (و فەرمانمان بەئادەمی دا) کە سوپاسگوزاری من (خوا) وباوک و دایکـت بە تەنهـا بـۆ لای مـنە گەڕانەوەتـان} [لقمان:١٤]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْـهِ إِحْسَـانًا حَمَلَتْـهُ أُمُّهُ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا وَحَمْلُهُ وَفِصَـالُهُ ثَـلَاثُـونَ شَـهْرًا حَتَّـىٰ إِذَا بَلَـغَ أَشُـدَّهُ وَبَلَـغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَـكَ الَّتِـي أَنْعَمْـتَ عَـلَيَّ وَعَـلَىٰ وَالِـدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِي إِنِّي تُبْـتُ إِلَيْـكَ وَإِنِّي مِـنَ الْمُسْـلِمِينَ } واتە: {وئێمە ئامۆژگاری ئادەمیمان کرد بە چاکە کردن لەگەڵ دايـك وباوكيـدا، دايكـی بە ناڕەحەتی وئازارەوە هەڵی گرتووە و بە ئازار وناڕەحەتیش بـوویەتی، مـاوەی دووگیـان بوون (ی دايـك) پێـیەوە هەتـا شـیر بـڕینەوەی سـی مـانگە تـا دەگـاتە تـافی لاوی (پێگەیشتوی لاشەیی و ژیری) و دەگاتە چل ساڵی، دەڵێ ئەی پەروەردگـار ئیلهـامم پێببەخشە تا سوپاسگوزار وشوکرانە بژێری ئەو بەهرە ونیعمەتانەت بکەم کە ڕشتوتە بە سەر من و دايـك وباوكمـدا و (ئیلهـامم پێببەخشـە) بـۆ ئەوەی کـردەوەی چـاکە ئەنجام بدەم کە تۆ پێی ڕازی بیت، نەوەکانیشم چاك و ساڵح بکە، بێگومان بۆلای تۆ گەڕاومەتەوە و بەڕاستی من لە موسوڵمانی گەردن کەچم (ملکەچم)}

[الأحقاف:١٥]. (وعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ أَحَقُّ النَّاسِ بِحُسْنِ صَحَابَتِي؟ قَالَ: «أُمُّكَ» قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «ثُمَّ أُمُّكَ» قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «ثُمَّ أُمُّكَ» قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «ثُمَّ أَبُوكَ») واته: (له ئەبی هورەیرەوە -ڕەزای خوای لێبێت- دەڵێت: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم-، و ووتی:ئەی پێغەمبەری خودا، ئایا کێ شایستەترە بۆ ئەوەی کە هاوەڵی چاک بم بەرامبەری؟ فەرمووی: «دایکت»، ووتی پاش ئەوەی کێ؟ فەرمووی: «دایکت»، ووتی: پاش ئەوەی کێ؟ فەرمووی: «دایکت»، ووتی: پاش ئەو کێ؟ فەرمووی: «باوکت»). [صحيح مسلم].

وئەم ئامۆژگاریکردنە بە چاکەکاری بەرامبەر دایک وباوک دەبێت جێبەجێ بکرێت ئەگەر مسوڵمان بن یان مسوڵمانیش نەبن، لە ئەسمائی کچی ئەبوبەکرەوە دەڵێت: «دایکم کە موشریک بوو، لەگەڵ کوڕەکەی هات بۆ ئەوەی سەردانیم بکات لە ماوەی پەیمانی لە نێوان قوڕەیش وپێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم-، بۆیە پرسیارم لە پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- کرد و ووتم: دایکم بە ویستی خۆی هاتووە، ئایا بە چاکی مامەڵەی لەگەڵدا بکەم؟ ئەویش -صلى الله عليه وسلم- فەرمووی: «بەڵێ، بە چاکی مامەڵەی لەگەڵدا بکە». [صحيح البخاري]، بەڵکو ئەگەر دایک وباوک هەوڵیاندا کە منداڵەکەیان لە پاش مسوڵمان بوون هەڵگەڕێتەوە وکافر بێت؛ ئەوا لێرەدا ئیسلام فەرمانی پێدەکات کە نابێت گوێڕایەڵی دایک وباوکی بکات لەمەدا ولە هەر تاوانێکی تریشدا، بەڵکو دەبێت لەسەر ئیمان ودینداریەکەی بەردەوام بێت؛ لەگەڵ ئەمەشدا دەبێت بەرامبەر دایک وباوکی باش بێت وبە چاکە مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، خوای گەورە دەفەرموێت: { وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَا وَصَاحِبۡهُمَا فِي ٱلدُّنۡيَا مَعۡرُوفٗاۖ وَٱتَّبِعۡ سَبِيلَ مَنۡ أَنَابَ إِلَيَّۚ ثُمَّ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ} واتە: {وئەگەر (باوك و

دایکت) ئەوپەڕی هەوڵیاندا لەگەڵت بۆ ئەوەی شتێك بکەیت بە هاوبەش من کە هیچ زانیارییەکت پێی نییە ئەوا گوێڕایەڵییان مەکە بەڵام لە دونیادا زۆر بە چاکی هاوڕێیەتی وهەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکە وشوێن ڕێبازی کەسێك بکەوە کە بە دڵسۆزی گەڕاوەتەوە بۆ لای من (لە دوارۆژدا) گەڕانەوەتان تەنها بۆ لای منە ئینجا هەواڵتان پێدەدەم سەبارەت بەو کردەوانەی کە دەتانکرد} [لقمان:١٥].

وئاینی ئیسلام ڕێگری ناکات لە چاکەکاری بەرامبەر کەسی موشریک ئەگەر خزم بێت یان خزم نەبێت؛ بەڵام بە مەرجێک دژی مسوڵمانان وئاینەکەیان نەبێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: {لَّا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ} واتە: {خودا نەهیتان لێناکات لەگەڵ ئەوانەی کە جەنگیان لەگەڵ نەکردوون لەسەر ئەم دینە ودەریان نەکردوون لە جێگا وشوێن وخاك و وڵاتی خۆتان کە چاکەیان لەگەڵ بکەن ودادگەربن لەگەڵیاندا بەڕاستی خودا ئەوانەی خۆش دەوێت کە دادگەرن} [الممتحنة:٨]. وئاینی ئیسلام فەرماندەکات بە ئامۆژگاری کردن وفێرکردنی منداڵەکان، ومەزنترین ئامۆژگاری کە پێویستە دایک وباوک فێری منداڵەکانیان بکەن بریتیە فێرکردنیان سەبارەت بە مافەکانی پەروەردگاریان لەسەیان، هەروەکو پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- فێری کوڕی مامی کرد (عبداللەی کوڕی عەباس) -ڕەزای خوایان لێبێت- : «يَا غُلامُ أَوْ يَا غُلَيِّمُ أَلا أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ يَنْفَعُكَ اللَّهُ بِهِنَّ؟ فَقُلْتُ: بَلَى. فَقَالَ: "احْفَظِ اللَّهَ يَحْفَظْكَ احْفَظِ اللَّهَ تَجِدْهُ أَمَامَكَ تَعَرَّفْ إِلَيْهِ فِي الرَّخَاءِ يَعْرِفْكَ فِي الشِّدَّةِ وَإِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلِ اللَّهَ وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ» واتە: «ئەی کوڕ (ئەی غوڵام)، ئایا هەندێک وشەت فێر بکەم کە بەهۆیانەوە خودا سوودت پێبگەیەنێت؟» ووتم: بەڵێ (فێرم بکەم)، فەرمووی:«سنوورەکانی شەریعەتی خودا بپارێزە؛ ئەوا خودا دەتپارێزێت، سنوورەکانی شەریعەتی خودا بپارێزە؛ ئەوا دەبینیت

خودا له پێشەوە لە گەڵ تۆدا دەبێت، خودا بناسە (لە خودا بترسە) لە کاتی خۆشی وئاساییدا؛ لە کاتی ناخۆشی تەنگانەدا وەڵامت دەداتەوە، ئەگەر داوات کرد؛ ئەوا تەنها داوا لە خودا بکە، وئەگەر داوای یارمەتی وپشتیوانیت کرد؛ ئەوا تەنها داوای یارمەتی وپشتیوانی لە خودا بکە» [رواه أحمد ٤/٢٨٧]. وخوای گەورە فەرمانی بە دایک وباوک کردووە کە منداڵەکانیان فێر بکەن سەبارەت بە ئەو شتانەی کە سوودیان پێدەگەیەنێت لە ئاینەکەیان ولە دونیایان، خوای گەورە دەفەرموێت: {يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ} واتە: {ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە خۆتان وکەسوکارتان بپارێزن لە ئاگرێك کە سووتەمەنیەکەی ئادەمی وبەردە، سەرپەرشتی ئەو (ئاگری دۆزەخە) چەند فریشتەیەکی زبر وتوندوتیژی وان کە نافەرمانی خودا ناکەن لەوەی کە فەرمانیان پێدەدات وچ فەرمانێکیان پێبدرێت ئەنجامی دەدەن} [سورة التحريم:٦]. وسەبارەت بەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت: {قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا } واتە: {ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە خۆتان وکەسوکارتان بپارێزن لە ئاگری دۆزەخێک، عەلی -ڕەزای خوای لێبێت- لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا دەڵێت: (پەروەردەیان بکەن وفێریان بکەن). وپێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- فەرمانیکردووە بە باوکان کە ڕۆڵەکانیان فێری نوێژکردن بکەن بۆ ئەوەی لەسەر ئەنجامدانی نوێژکردن پەروەردە ببن، پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: (مُرُوا أولادكِم بالصلاةِ وهم أبناءُ سبعِ سِنينَ) واتە: (فەرمانی نوێژکردن بە منداڵەکانتان بکەن؛ لە تەمەنی حەوت ساڵیاندا) [رواه أبو داود]، و -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ الإِمَامُ رَاعٍ وَمَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ وَالرَّجُلُ رَاعٍ فِي أَهْلِهِ وَهُوَ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا وَمَسْؤُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا والخادمُ راعٍ في مالِ سيِّدِه ومسؤولٌ

عــن رعيَّتِــه وكلُّكــم راعٍ ومســؤولٌ عــن رعيَّتِــه» واته: «هەمووتــان شــوانن، وهەریەکێکتان بەرپرسـیارە بەرامبـەر ژێردەسـتەکەی: دەسـەڵاتدار (ئەمیـر) شـوانە وبەرپرسیارە بەرامبەر ژێردەستەکەی، پیاو شوانە وبەرپرسیارە بەرامبەر خێزانەکەی، وئافرەت شوانە وبەرپرسیارە بەرامبەر ماڵی مێردەکەی ومنداڵەکانی، خزمەتکار شوانە وبەرپرسیارە بەرامبەر ماڵ وسـامانی گەورەکەی، وهەمووتـان شـوانن وبەرپرسـیارن بەرامبەر ژێردەستەکانتان». [صحیح بن حبـان: ٤٤٩٠]. وئـاینی ئیسـلام فەرمـانی بە باوک کردووە بە خەرجی کـردن ودابینکردنـی پێداویسـتیەکانی دایـک ومنـداڵەکان وپێشتر ئەمە باسکراوە لە بڕگەی ژمـارە (١٨) وپێغەمـبەر -صـلی الـله علـیه وسـلم- فەزڵی خەرجی لەسەر منداڵەکانی ڕوونکردووەتەوە کە دەفەرموێـت: «أَفْضَـلُ دِينَـارٍ يُنْفِقُهُ الرَّجُلُ: دِينَارٌ يُنْفِقُهُ عَلَى عِيَالِهِ وَدِينَارٌ يُنْفِقُهُ الرَّجُـلُ عَـلَى دَابَّتِـهِ فِي سَـبِيلِ اللَّهِ وَدِينَارٌ يُنْفِقُهُ عَلَى أَصْحَابِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ». قَالَ أَبُو قِلَابَةَ: «وَبَـدَأَ بِالْعِيَـالِ ثُـمَّ قَـالَ أَبُـو قِلَابَةَ: وَأَيُّ رَجُلٍ أَعْظَمُ أَجْرًا مِنْ رَجُلٍ يُنْفِقُ عَلَى عِيَالٍ صِغَارٍ يُعِفُّهُمْ أَوْ يَنْفَعُهُمُ اللَّهُ بِـهِ وَيُغْنِيهِمْ» واته: ««باشترین دینار (پارە) کە کەسێک خەرجـی بکـات پـارەیەکە کە لە سەر منداڵەکانی خەرجی بکات، وپارەیەک لە سەر ئـاژەڵەکەی خەرجـی بکـات لە پێناو خوای گەورە (لە جیهاددا)، وپارەیەک خەرجـی بکـات لەسـەر هاوڕێکـانی لە پێناو خوای گەورە» ئەبو قیلابە دەڵێت: «وسەرەتا بە منداڵەکان دەستی پێکـرد، وکـێ لەو پیاوە گەورەترە کە خەرجی دەکات لەسەر منـداڵەکانی بـۆ ئەوەی بیانپارێزێـت لە هەژاری وسوودیان پێبگەیەنێت ودەوڵەمەند بن» [صحیح مسلم: ٩٩٤].

## ٣٠. ئاینی ئیسلام فەرماندەکات بە دادپەروەر بوون لە وتە وکـردەوەدا تەنانەت ئەگەر بەرامبەر دوژمنانیش بێت.

خوای گەورە -سبحانە وتعـالی- وەسـف دەکرێـت بە ئەوپەڕی دادپەروەری لە کردەوەکانی وبەڕێوەبردنی لە نێوان بەندەکان وئەو زاتە پیرۆزە لەسەر ڕێگـای ڕاسـتە لەو شتانەی فەرمانی پێدەکات ونەهـی لێـدەکات ولە دروسـتکردن (خولّقانـدن) ولە قەدەر وقەزا وبڕیارەکانیدا، خوای گەورە دەفەرموێت: {شَـهِدَ اللَّهُ أَنَّـهُ لَا إِلَٰـهَ إِلَّا هُـوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْـطِ لَا إِلَٰـهَ إِلَّا هُـوَ الْعَزِيـزُ الْحَكِـيمُ } واتە: {خـودا شاهێدی دەدات (واتە ڕایدەگەیەنێت وبە بەڵگە دەیچەسـپێنێت) کە بەڕاسـتی هـیچ پەرستراوێکی بە هەق وڕاست نییە کە شایەنی پەرستن بێت جـگە لە ئەو زاتە مەزنە نەبێت وفریشتەکانیش شاهێدی دەدەن (واتە: دانیپێدا دەنـێن) وخـاوەن زانسـتەکان (زانایـان)یش شـاهێدی دەدەن (واتە: بـاوەڕی چەسـپاویان هەیە)، خـودا هەمیشـە دادپەروەری ڕاگرتووە؛ هیچ پەرستراوێکی هەق وڕاست نییە کە شایەنی پەرستن بێت جگە لە ئەو وخودا شکۆدار ودانایە} [آل عمران:١٨]. وخودا فەرمـان بە دادپەروەری دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت: {قُـلْ أَمَـرَ رَبِّي بِالْقِسْـطِ} واتە: {بڵـێ پەروەردگـارم فەرمانی بە دادپەروەری داوە} [الأعراف:٢٩].

وهەموو پێغەمبەرانی خودا دادپەروەریان هێناوە وبەرپایان کردووە -علـیهم الصلاة والسلام-، خوای گەورە دەفەرموێت: {لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَـابَ وَالْمِيـزَانَ لِيَقُـومَ النَّـاسُ بِالْقِسْـطِ} واتە: {سـوێند بەخـوا بەڕاسـتی ئـێمە پێغەمبەرانی خۆمانمان ناردووە بە بەڵگە وموعجیزەی ڕوونەوە و کتێبـی (ئاسـمانی) وتەرازوی دادمان لەگەڵدا ناردن بۆ ئەوەی خەڵکی بە دادگەری ڕەفتار بکەن (لەنـاو خۆیاندا)} [الحدید:٢٥]. وتەرازوو بریتیە لە دادپەروەری لە وتەکـان وکردەوەکانـدا. وئاینی ئیسلام فەرماندەکات بە دادپەروەر بوون لە قسـەکان وکردەوەکانـدا تەنـانەت

ئەگەر بەرامبەر دوژمنانیش بێت، خوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰ أَنفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ ۚ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَاللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ۖ فَلَا تَتَّبِعُوا الْهَوَىٰ أَن تَعْدِلُوا ۚ وَإِن تَلْوُوا أَوْ تُعْرِضُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا} واته: {ئەی کەسانێک کە باوەڕتان هێناوە بەردەوام زۆر دادگەر بن لەبەر خوا شاهێدی بدەن با شاهێدیەکە دژ بە ئێوەش بێت یان دژی باوک ودایک و دژی خزمە نزیکەکانتان (بێت) ئەگەر (شاهێدی لەسەر دراوەکە) دەوڵەمەند بێت یان هەژار (شاهێدیەکە هەر بدەن) چونکە خوا بەرژەوەندی وسوودی ئەوان باشتر دەزانێت کەواتە شوێن ئارەزوو مەکەون بۆ ئەوەی لە هەق لانەدەن وئەگەر (شاهێدیەکە) پێچەوانە بدەن یان نەیدەن و گوێی پێنەدەن ئەوا بەڕاستی خوا هەمیشە بە کارەکانتان ئاگادارە} [النساء:١٣٥]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَن تَعْتَدُوا ۘ وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۖ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ} واته: {با خەشم و قینتان لە کۆمەڵێک واتان لێنەکات بەهۆی ئەوەی کاتی خۆی نەیانهێشت تەواف بە دەوری کەعبە بکەن؛ دەست درێژی بکەن و کۆمەکی یەکتری بکەن لە سەر چاکە و پارێزگاری و لە خوا ترسان و کۆمەکی یەکتر مەکەن لەسەر تاوان و دەست درێژی و لە خوا بترسن بێگومان تۆڵە وسزای خوا بەتینە} [المائدة:٢]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ ۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَىٰ أَلَّا تَعْدِلُوا ۚ اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ} واته: {ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە زۆر بە ڕێکوپێکی هەستن بەئەنجامدانی فەرمانەکانی خوا شاهێدیدەر بن بە داد و ڕاستی با ڕق و کینەتان لەدەستە و کۆمەڵێک هانتان نەدات لەسەر ئەوەی ڕاست نەڕۆن و دادگەر نەبن دادگەربن ئەوە نزیکترە لە پارێزکاری (تەقواداری)} [المائدة:٨].

ئایا لە یاسای گەلەکان یان ئاینی خەڵکی لە ئەمڕۆدا شتی وەکو ئەمە دەبینین کە بریتیە لە شاهێدی دان بە هەق و ووتنی ڕاستی هەتا تەنانەت ئەگەر لەسەر نەفسی خۆت ودایک وباوک وکەسە نزیکەکانیش بێت، وفەرمانکردن بە دادپەروەر بوون بەرامبەر دوژمن ودۆست. وپێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- فەرمانی کردووە بە دادپەروەر بوون لە نێوان منداڵەکاندا، عامر دەڵێت: گوێم لە نوعمانی کوڕی بەشیر بوو -ڕەزای خوای لێبێت- کە لەسەر مینبەر دەیووت: (باوکم دیاریەکی پێدام)، بەڵام عەمرەتی کچی ڕەواحە -دایکی نوعمان- ووتی: (من ڕازی نیم لەسەر ئەم دیاری بەخشینە هەتاوەکو پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- شاهێدی لەسەر دەدات)، باوکم -بەشیر- چوو بۆ لای پێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- و ووتی: (من دیاریەکم بەخشی بە کوڕەکەم -نوعمان- کە دایکی -عەمرەتی کچی ڕەواحە- پێی بەخشی، وداوای لە من کرد کە تۆ بکەم بە شاهێد لەسەر ئەمە)، ئەویش -صلى الله عليه وسلم- فەرمووی: «ئایا هەمان شتت بەخشی بە هەموو منداڵەکانت؟»، ئەویش (بەشیر) ووتی: نەخێر، پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- فەرمووی: «تەقوای خوا بکەن -لە خوا بترسن-، ودادپەروەر بن لە نێوان منداڵەکانتان»، گێڕەرەوەی فەرموودەکە دەڵێت: وپاشان (بەشیر) گەڕایەوە ودیاریەکەی وەرگرتەوە. [صحيح البخاري: ٢٥٨٧]. دادپەروەری تاکە هۆکارە بۆ پاراستنی سەقامگیری خەڵک و وڵاتان. بەبێ ئەوە خەڵک هەست بە سەلامەتی ناکات لە سەر دین و ژیان و منداڵ و شەرەف و ماڵ و وڵاتیان. هەر لەبەر ئەم هۆیە پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- فەرمانی بە موسڵمانان کرد کە کۆچ بکەن بۆ حەبەشە، پاش ئەوەی لەسەر دەستی کافرەکانی مەککە دەچەوسێندرانەوە. هۆکاری هەڵبژاردنی حەبەشە ئەوە بوو کە پاشاکەی دادپەروەر بوو و هیچ کەس لە ژێر دەسەڵاتی ئەودا ستەمی لێ نەکرابوو.

## ٣١. ئـاینی ئیسـلام فەرمانـدەکات بە چاکەکـار بـوون بەرامـبەر بە هەموو بوونەوەرەکان، وبانگەشە دەکات بۆ ڕەوشت وکردەوە جوانەکان.

ئاینی ئیسلام فەرماندەکات بە چاکەکاری بەرامبەر هەموو خەڵکـی، خـوای گەورە دەفەرموێـت: {إِنَّ اللَّهَ يَـأْمُرُ بِالْعَـدْلِ وَالْإِحْسَـانِ وَإِيتَـاءِ ذِي الْقُـرْبَىٰ } واتە: {بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بە دادگەری وبە چاکە وبە بەخشین بە خزم وکەسوکار} [النحـل:٩٠]. وخـوای گەورە دەفەرموێـت: {الَّـذِينَ يُنفِقُـونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِـبُّ الْمُحْسِـنِينَ} واتە: {ئەوانەی مـاڵ دەبەخشن (لە پێنـاوی خـوادا) لە کـاتی خۆشـی (دەوڵەمەنـدی) وناخۆشـیدا وڕقـی بەتینی خۆیان دەخۆنەوە و دەبوورن لە خەڵکی وخوداش چاکەکـارانی خۆشـدەوێت} [آل عمران : ١٣٤]. وپێغەمبەر موحەممەد -صلی الله علیـه وسـلم- دەفەرموێـت: «إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الإحْسَانَ علَى كُلِّ شيءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُم فأحْسِنُوا القِتْلَةَ، وإذَا ذَبَحْـتُمْ فأحْسِـنُوا الذَّبْحَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ، فَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ» واتە: «خوای گەورە چاکەکاری لە سەر هەموو شتێک نووسیوە، ئەگەر کوشتاریەکتان کرد؛ ئەوا بە چـاکی ئەنجـامی بـدەن، وئەگەر سەربڕینێکتان کـرد؛ ئەوا بە چـاکی ئەنجـامی بـدەن، وبـا یەکێـک لە ئێـوە تیغەکەی تیژ بکات بـۆ ئەوەی نـاڕەحەتی لە سـەر سـەربڕاوەکە لابـدات». [صـحیح مسـلم: ١٩٥٥]. وئـاینی ئیسـلام بانگەشـە دەکـات بـۆ ڕەوشـتە جوانەکـان وکـردەوە چاکەکان، خوای گەورە سەبارەت بە سیفەتی پێغەمبەر موحەممەد -صـلی الـله علـیه وسلم- لە کتێبەکانی پێشووتردا دەفەرموێت: {الَّـذِينَ يَتَّبِعُـونَ الرَّسُـولَ النَّبِـيَّ الْأُمِّـيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنجِيـلِ يَـأْمُرُهُم بِـالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَـاهُمْ عَـنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِـثَ وَيَضَـعُ عَـنْهُمْ إِصْرَهُـمْ وَالْأَغْـلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُـوا النُّـورَ الَّـذِي أُنـزِلَ مَعَـهُ أُولَٰئِكَ هُـمُ الْمُفْلِحُـونَ} واتە: {(ئەم ڕەحـمەتەی پەروەردگـار) بـۆ ئەوانەیە کە شـوێن

(پێغەمــبەر -صــلی الله علیــه وســلم-) دەکەون کە پێغەمبەرێکــی نەخوێنــدەوارە و (لەلایەن پەروەردگارەوە هاتووە) ئەو کەسە (پێغەمبەرێکە ئەهلی کتێب سیفەتەکانی دەزانن ودەیناسن) چونکە بە نووسراوی لایانە لە تەورات و ئینجیلــدا کە فەرمانیــان پێ دەکات بە چاکە و ڕێگرییان لێ دەکــات لە خــراپە وشــتە پاکەکانیــان بــۆ حەڵاڵ دەکات وشتە پیسەکانیان لێ حەرام (قەدەغە) دەکات و بارە قــورس وگرانەکــان وئەو کۆت و زنجیرانەش کە بەسەریانەوە بوون لەسەریان لای دەبات ئەمجا ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بەو (پێغەمبەرە) هێنابێت و ڕێزو قەدریان بۆ دانابێت یارمەتیان دابێت و پشتیوانیان لێ کردبێت و پەیڕەوی ئەو نوورەیان کردبێت (کە قورئــانە) کە لەگەڵیــدا نێــردراوەتە خــوارەوە ئەوان (کە باســکران) لە ڕزگــار بــووانن} [الأعــراف:١٥٧].

وپێغەمبەری خودا -صلی الله علیــه وســلم- دەفەرموێــت: «يَـا عَائِشَــةُ إِنَّ اللّٰهَ رَفِيـقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ وَيُعْطِي عَلَى الرِّفْقِ مَا لَا يُعْطِي عَلَى الْعُنْفِ وَمَا لَا يُعْطِـي عَـلَى مَـا سِـوَاهُ» واتە: «ئەی عائیشە، خــودا میهرەبــانە، وبە بەزەیــی ونەرم ونیــان بــوونی -میهرەبــانی- خۆشدەوێت؛ وئەوەی لەسەر میهرەبــانی ونەرم ونیــان بــوون دەیبەخشــێت؛ ئەوەنــدە بەهــۆی تونــد بــوون وهەرشــتێکی تــرەوە نابەخشــێت» [صــحيح مســلم: ٢٥٩٣].

وپێغەمبەری خودا -صلی الله علیه وسلم- دەفەرموێت: «إِنَّ اللّٰهَ حَرَّمَ عَلَيْكُمْ: عُقُوقَ الأُمَّهَاتِ وَوَأْدَ البَنَاتِ وَمَنَعَ وَهَاتِ وَكَرِهَ لَكُمْ قِيلَ وَقَالَ وَكَثْرَةَ السُّـؤَالِ وَإِضَـاعَةَ المَـالِ» واتە: «خــوای گەورە حەرامــی کــردووە لەســەرتان: خراپەکــاری بەرامــبەر دایکــات، وکوشتنی کچان، (وجێبەجێ نەکردنــی ئەرک ومافێــک لەســەری بێــت وداواکردنــی مافێک کە هی خۆی نەبێت -یان ووتراوە: [ومنعَ وهاتِ] واتا/ نەبەخشین وجێبەجــێ نەکردنی ئەو شتانەی خودا فەزری کردووە ببەخشرێت، داواکردنــی ئەو شــتانەی کە خودا حەرامی کردووە-). وخودا حەز ناکات لە: قسە هێنان وبردن -قسە زۆر کردن-، وزۆر پرسیار کردن، وبە فیڕۆدانی سامان» [صــحيح البخــاري: ٢٤٠٨]. وپێغەمــبەری

خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «لَا تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا أَوَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ؟ أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ» واتە: «سوێند بە ئەو زاتەی کە نەفسی منی بە دەستە، ناچنە بەهەشتەوە هەتا ئیمان نەهێنن، وئیمان (باوەڕ) ناهێنن هەتا یەکترتان خۆش نەوێت، ئایا شتێکتان پێ بڵێم کە بەهۆیەوە یەکتریان خۆش دەوێت؟ سەلام کردن بڵاو بکەنەوە لە نێوانتاندا». [صحيح مسلم: ٥٤].

## ٣٢. وئاینی ئیسلام فەرمان بە ڕەوشتە جوانەکان دەکات وەکو ڕاستگۆیی وپاراستنی سپاردە (ئەمانەت) وداوێن پاکی وشەرم کردن وئازایەتی وبەخشندەیی وبەخشین وڕێزلێنان ویارمەتیدانی خاوەن پێویستیەکان ویارمەتیدانی کەسانی لێقەوماو وتێرکردنی برسیەکان وچاکبوون بەرامبەر دراوسێ وگەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی ونەرم ونیانی بەرامبەر ئاژەڵەکان.

ئاینی ئیسلام فەرمان دەکات بە ڕەوشتە جوان وچاکەکان، پێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: (إِنَّمَا بُعِثْتُ لِأُتَمِّمَ صَالِحَ الْأَخْلَاقِ) واتە: (نێردراوم بۆ ئەوەی ڕەوشتە جوانەکان تەواو وکامڵ بکەم) [صحيح الأدب المفرد ٢٠٧]، وپێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: (إنَّ من أحبِّكم إليَّ ، وأقربِكم مني مجلسًا يومَ القيامةِ أحاسِنُكم أخلاقًا ، وإنَّ أبغضَكم إليَّ وأبعدَكم مني مجلسًا يومَ القيامةِ الثَّرثارونَ ، والمُتشدِّقونَ ، والمُتفيهقونَ ، قالوا : قد علِمْنا الثرثارونَ و المتشدِّقونَ ، فما المتفيهقونَ ؟ قال : المُتكبِّرونَ) واتە: (ئەو کەسەی لە لای من خۆشەویستترە ولە دانیشتنی من نزیکترە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو کەسەتانە

کە جوانترین ڕەوشتی هەیە، وئەوەی زیاتر ڕقم لێیەتی ولە دانیشتنی من دوورتر دەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا -لە بەهەشتدا- (ئەم جۆرە کەسانەن): [سەرسارەکان] ئەوانەی زۆر قسە دەکەن -بە بێ سوود-، و [موتەشەدیقەکان] ئەوانەی قسە فراوان وقووڵ دەکەن بە ناهەق (بۆ گاڵتە کردن بە خەڵکی)، و[موتەفەیقیهەکان]» ووتیان: ئەی پێغەمبەری خودا [سەرسارەکان] و[موتەشەدیقەکانمان] زانی، ئەی [موتەفەیقیهەکان] کێن؟، -صلی الله علیه وسلم- فەرمووی: «ئەوانەی خۆبەگەورەزانن»). [السلسة الصحيحة: ٧٩١]. لە عبداللەی کوڕی عەمرو -ڕەزای خوایان لێبێت- دەڵێت: پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم- کەسێکی جوێندەر و جوێن فرۆش نەبوو، ودەیفەرموو: «إن من خياركم أحسنكم أخلاقًا». واتە: «باشترین وخێرترینتان ئەوانەن کە جوانترین ڕەوشتیان هەیە». [صحيح البخاري: ٣٥٥٩].

وئایەت وفەرموودەی تریش زۆرن کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئاینی ئیسلام ئامۆژگاری دەکات بە ڕەوشتە جوانەکان وکردەوە چاکەکان بە شێوەیەکی گشتی. ولەو ئاکارە بەرزانەی کە ئاینی ئیسلام فەرمانی پێدەکات بریتیە لە: ڕاستگۆیی، پێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: (عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ فَإِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَصْدُقُ وَيَتَحَرَّى الصِّدْقَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللهِ صِدِّيقًا) واتە: (دەستبگرن بە ڕاستگۆییەوە، چونکە ڕاستگۆیی ڕێنیشاندەرە بەرەو چاکەکاری، وچاکەکاری ڕێنیشاندەرە بەرەو بەهەشت، وکەسێک ڕاستگۆیە وبەردەوام بە دوای ڕاستگۆییدا دەگەڕێت؛ هەتا لای خوای گەورە بە ڕاستگۆ لە قەڵەم دەدرێت) [صحيح مسلم: ٢٦٠٧]. لەو ڕەوشتە جوانانەی کە ئیسلام فەرمانی پێکردووە بریتیە لە پاراستنی سپاردە (ئەمانەت)، خوای گەورە دەفەرموێت: {إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَىٰ أَهْلِهَا} واتە: {بەڕاستی خوا فەرمانتان پێ دەکات بەدانەوەی گشت سپاردەکان بۆ خاوەنەکانیان} [النساء:٥٨].

لەو ڕەوشتە جوانانەی کە ئیسلام فەرمانی پێکردووە بریتیە لە داوێن پاکی وپاکیزەیی وخۆ دوورگرتن لە پـیس وبـۆگەنی تاوانەکـان، پێغەمـبەر -صـلی الـله علـیە وسـلم- دەفەرموێت: «ثلاثة حق على الله عونهم: وذكر منهم: والناكح الـذي يريـد العفـاف» واتە: «سێ کۆمەڵ مافە لەسەر خوای گەورە کە یارمەتیان بـدات: ویەکێـک لەوانەی کە باسیکرد: ئەو کەسەی دەیەوێت هاوسەرگیری بکات بۆ ئەوەی داوێنی خۆی پاک ڕابگرێت» [سنن الترمذي: ١٦٥٥]. ولە نزاکانی پێغەمبەر -صلى الله علیە وسلم- ئەوە بوو کە دەیفەرموو: «اللهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى وَالتُّقَى وَالْعَفَافَ وَالْغِنَى» واتە: «خودایە، من داوای هیدایەت، وتەقواداری، وداوێن پاکی، ودەوڵەمەندیت لێـدەکەم» [صـحيح مسلم: ٢٧٢١]. لەو ڕەوشتە جوانانەی کە ئیسلام فەرمانی پێکردووە بـریتیە لە شـەرم کردن (الحياء)، پێغەمبەر -صلى الله علیە وسـلم- دەفەرموێـت: «الْحَيَـاءُ لَا يَـأْتِي إِلَّا بِخَيْرٍ» واتە: «شەرم کردن هیچ شتێک ناهێنێت جـگە لە خێـر» [صـحيح البخـاري: ٦١١٧]، وپێغەمبەری خودا -صلى الله علیە وسـلم- دەفەرموێـت: «لِكُـلِّ دِيـنٍ خُلُـقٌ وَخُلُقُ الْإِسْلَامِ الْحَيَاءُ» واتە: «هەموو ئەهلی -شوێنکەوتووانی-ئاینێـک ڕەوشـتێکیان (ڕەوشتێکی تایبەتیان) هەیە، وڕەوشتی (تایبەتی) ئەهلی ئیسلام -مسوڵمانان- بریتیە لە شەرم کردن» [شعب الإيمان/ البيهقي: ٦/٢٦١٩].

ولەو ئاکارە جوانانەی ئاینی ئیسلام فەرمانی پێدەکات؛ بـریتیە لە ئـازایەتی، لە ئەنەسەوە -ڕەزای خوای لێبێت- دەڵێت: «كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحْسَـنَ النَّاسِ وَأَشْجَعَ النَّاسِ وَأَجْوَدَ النَّاسِ وَلَقَدْ فَزِعَ أَهْلُ المَدِينَةِ فَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عليْهِ وَسَلَّمَ سَبَقَهُمْ عَلَى فَرَسٍ» واتە: «پێغەمبەر -صلى الله علیە وسلم- باشترین وئـازاترین وبەخشندەترین مرۆڤ بوو لە نێو خەڵکیدا، وجارێکیـان خەڵکـی مەدینـە تووشـی تـرس بـوون بەڵام پێغەمـبەر -صـلی الـله علـیە وسـلم- پێشـیان کەوت بە سـواری ئەسـپێکەوە (بـۆ ئەوەی دڵنیایـان بکـاتەوە ونەترسـن)» [صـحيح البخـاري: ٢٨٢٠].

پێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- پەنای بە خودا دەگـرت لە ترسـنۆکی، بـۆیە دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الجُبْنِ» واتە: «خـودایە، مـن پەنـات پێـدەگرم لە ترسنۆکی» [صحيح البخاري: ٦٣٧٤]. لەو ڕەوشـتە جوانـانەی کە ئیسـلام فەرمـانی پێکردووە بریتیە لە بەخشین وسـەخاوەت ورێزلێنـان (خزمەتکـردن)، خـوای گەورە دەفەرموێت: {مَّثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنبُلَةٍ مِّائَةُ حَبَّةٍ ۗ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَن يَشَاءُ ۗ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ} واتە: {وێـنەی (خێری) ئەوانەی کە ماڵی خۆیان دەبەخشن لە ڕێـی خـوادا وەک دەنـکە (تۆوێـک) وایە (ڕوابێت) وحەوت گوڵی گرتبێت لەهەر گوڵێکدا سـەد دانەی تێـدا بێـت وخـوا لەمەش زیاتری دەکات بۆ هەرکەسێک کە خـۆی بیەوێـت وە خـوا خـاوەن بەهـرەی فراوانی زانایە (ئاگادارە)} [البقرة:٢٦١]. وبەخشندەیی ڕەوشتی پێغەمبەر -صـلى الـله عليه وسلم- بوو، لە ئیبن عەباسەوە -ڕەزای خوایان لێبێت- دەڵێت: «كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَجْوَدَ النَّاسِ بِالخَيْرِ وَكَانَ أَجْوَدُ مَا يَكُونُ فِي رَمَضَانَ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ وَكَانَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلاَمُ يَلْقَاهُ كُلَّ لَيْلَةٍ فِي رَمَضَانَ حَتَّى يَنْسَلِخَ يَعْرِضُ عَلَيْـهِ النَّبِـيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ القُرْآنَ فَإِذَا لَقِيَهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّـلاَمُ كَـانَ أَجْـوَدَ بِـالخَيْرِ مِـنَ الرِّيحِ المُرْسَلَةِ» واتە: «پێغەمبەری خـودا -صـلى الـلە علـيه وسـلم- بەخشـندەترین وسەخیترین کەس بوو لە نێو خەڵکیدا، ولە مـانگی ڕەمەزانیشـدا بەخشـندەتر بـوو زیاتر لە هەموو کاتەکانی تر، کاتێک جبریل -عليه السلام- دەهات بـۆ لای، جبریـل هەموو شەوێکی مانگی ڕەمەزان فێری قورئانی پیـرۆزی دەکـرد وپێـداچوونەوەی بـۆ دەکرد، بۆیە پێغەمبەری خودایش -صلى الله عليه وسلم- سەخیتر بوو لە خێرکردندا زیاتر لە خێرایی شنە بای نێردراو» [صحيح البخاري: ١٩٠٢].

لەو کـردەوە چاکـانەی کە ئـاینی ئیسـلام فەرمـانی پێـدەکات: یارمەتیـدانی خـاوەن پێویسـتیەکان ویارمەتیـدانی کەسـانی لێقەومـاو وتێرکردنـی برسـیەکان

وچاکبوون بەرامبەر دراوسێ وگەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی ونەرم ونیانی بەرامبەر ئاژەڵەکان. لە عبداللەی کوڕی عەمرو -ڕەزای خوایان لێبێت- دەڵێت: «پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم- کرد: چی کردەوەیەک لە ئیسلامدا باشترین وچاکترینە؟ -صلی الله علیه وسلم- فەرمووی: «خواردن ببەخشیت وسەلام بکەیت لە هەرمسوڵمانێک بیناسیت یان نەیناسیت»». [صحيح البخاري: ١٢].

وپێغەمبەری خودا -صلی الله علیه وسلم- دەفەرموێت: «بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ اشْتَدَّ عَلَيْهِ العَطَشُ فَوَجَدَ بِئْرًا فَنَزَلَ فِيهَا فَشَرِبَ ثُمَّ خَرَجَ فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ العَطَشِ فَقَالَ الرَّجُلُ: لَقَدْ بَلَغَ هَذَا الكَلْبَ مِنَ العَطَشِ مِثْلُ الَّذِي كَانَ بَلَغَ بِي فَنَزَلَ البِئْرَ فَمَلأَ خُفَّهُ ثُمَّ أَمْسَكَهُ بِفِيهِ فَسَقَى الكَلْبَ فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَإِنَّ لَنَا فِي البَهَائِمِ أَجْرًا؟ فَقَالَ: «نَعَمْ فِي كُلِّ ذَاتِ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ» واتە: «پیاوێک بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشت وزۆر تینووی بوو، وبیرێکی دۆزیەوە ودابەزی وئاوی لێ خواردەوە وپاشان دەرچوو و(بینی) سەگێک زمانی دەرهێناوە لە تینوێتیدا لە خۆڵی خاکەکە دەخوات، پیاوەکە ووتی: ئەم سەگە تینوویەتی وەکو چۆن من تینووم بوو، بۆیە دابەزی بۆ نێو بیرەکە وخوفەکەی (پێڵاوەکەی) پڕ کرد (لە ئاو) وبە دەمی گرتی (هەتا هاتە سەرەوە)، ودای بە سەگەکە، وبۆیە خوای گەورە سوپاسی پیاوەکەی کرد بەهۆی ئەم کردەوەیە ولە تاوانەکانی خۆش بوو»، ووتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ئایان پاداشتمان بۆ دەنووسرێت بەهۆی چاکەکردن بەرامبەر ئاژەڵەکان؟ ئەویش -صلی الله علیه وسلم- فەرمووی: «بەڵێ، (چاکەکردن) بەرامبەر هەموو بوونەوەرێک پاداشتی لەسەرە» [صحيح بن حبان: ٥٤٤]. وپێغەمبەری خودا -صلی الله علیه وسلم- دەفەرموێت: «السَّاعِي عَلَى الأَرْمَلَةِ وَالمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوِ القَائِمِ اللَّيْلَ الصَّائِمِ النَّهَارَ» واتە: «ئەو کەسەی پێداویستیەکانی بێوەژن وهەژار جێبەجێدەکات وەکو کەسی موجاهید وتێکۆشەر وایە لە پێناو خوای گەورە

یان وەکو ئەو کەسە وایە لە شەودا (بەردەوام) شەونوێژ دەکات و لە ڕۆژدا (بەردەوام) بەڕۆژوو دەبێت». [صحيح البخاري: ٥٣٥٣]، وئاینی ئیسلام پێداگیری دەکات لەسەر مافی خزم وکەسە نزیکەکان وگەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی واجبە، خوای گەورە دەفەرموێت: {النَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ وَأُولُو الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ إِلَّا أَن تَفْعَلُوا إِلَىٰ أَوْلِيَائِكُم مَّعْرُوفًا كَانَ ذَٰلِكَ فِي الْكِتَابِ مَسْطُورًا} واتە: {پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- لە خودی بڕواداران بۆ خۆیان لە پێشترە خێزانەکانیشی دایکی باوەڕدارانن و ئەوانەی (بە ڕەچەڵەک -نەسەب-) خزمی یەکترن (ئەگەر موسڵمان بن) لە قورئانی خوا بۆ یەکتری لە پێشترن (میرات لە یەکتر بەرن) لە ئیمانداران و کۆچەران (کە خزم نین) مەگەر خۆتان چاکەیەك (بەخشین یان وەسیّتێك) بۆ دۆست و خۆشەویستانتان بکەن ئەو بڕیارە لە قورئان (یان لە لوح المحفوظ دا) نووسراوە} [الأحزاب:٦].

وهەروەشە وئاگاداری داوە سەبارەت بە پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی ولەگەڵ خراپەکاری نانەوە لەسەر زەویدا باسی کردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: {فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ (٢٢) جا ئایا ئێوە بەتەمان (ئەی ناپاکان) ئەگەر پشت هەڵبکەن (لە ئیسلام وجیهاد) لە زەویدا ئاژاوە وخراپە بەرپابکەن وە هەرچی پەیوەندی خزمایەتیە بیبچڕێنن (٢٢) أُولَٰئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰ أَبْصَارَهُمْ (٢٣) ئا ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوا نەفرەتی لێکردوون وە کەڕی کردوون وچاویانی کوێر کردووە (٢٣)} [محمد:٢٢-٢٣]. وپێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَاطِعُ رَحِمٍ» واتە: «ئەو کەسەی پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنێت ناچێتە بەهەشتەوە». [صحيح مسلم: ٢٥٥٦]. وئەو خزمانەی کە واجبە پەیوەندی هەبێت لەگەڵیان وسەردانیان بکرێت: دایک وباوک، برا، خوشک، داپیرە، باپیرە، مام، خاڵ، پور (میمک). وئاینی

ئیسلام گرنگی دەدات بە مافی دراوسێ ئەگەرچیش کافر بێت، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا ۖ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَبِذِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينِ وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَىٰ وَالْجَارِ الْجُنُبِ وَالصَّاحِبِ بِالْجَنبِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا} واتە: {بەس خوا بپەرستن، و هیچ شتێک مەکەن بە هاوبەشی هەروەها لەگەڵ دایک و باوکتاندا چاک بن و لەگەڵ خزم و نزیکان و هەتیوان و هەژاران وهاوسێی خزم و هاوسێی بێگانە یا دوور و هاوڕێی هەمیشەیی یا هاوڕێی سەفەر و ڕێبوار و ئەوانەی بوون بە موڵکتان (چاک بن لەگەڵیاندا) بەڕاستی خوا خۆشی ناوێت ئەو کەسەی کە خۆ بەزلزان وشانازیکار بێت} [النساء:٣٦]. وپێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: (مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالْجَارِ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ) واتە: (جبریل بەردەوام وەسیەت وئامۆژگاری دەکردم سەبارەت دراوسێ هەتا گومانم وابوو کە دەبێتە میراتگریش). [صحيح أبي داود: ٥١٥٢].

## ٣٣. وئاینی ئیسلام شتە پاکەکانی حەڵاڵ کردووە لە خواردن وخواردنەوەکان وفەرمانی کردووە بە پاکژکردنەوەی دڵ ولاشە وماڵ، وهاوسەرگیری حەڵاڵکردووە، و بەهەمان شێوە فەرمانی بە پێغەمبەران کردووە -عليهم السلام-، بۆیە ئەوان تەنها فەرمانی شتی پاک بە خەڵکی دەکەن.

ئاینی ئیسلام خواردن وخواردنەوە پاکەکانی حەڵاڵ کردووە، پێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ اللَّهَ طَيِّبٌ لَا يَقْبَلُ إِلَّا الطَّيِّبَ وإِنَّ اللَّهَ أَمَرَ الْمُؤْمِنِينَ بِمَا أَمَرَ بِهِ الْمُرْسَلِينَ قَالَ تعالى: {يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ

الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ} وَقَالَ تعالى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طِيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ واشكروا لله إن كنتم إياه تعبدون} الآية قَالَ: ثُمَّ ذَكَرَ الرَّجُلَ يُطِيلُ السَّفَرَ أَشْعَثَ أَغْبَرَ يَمُدُّ يَدَيْهِ إِلَى السَّمَاءِ: يَا رَب يَا رَبِّ وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ وَغُذِّيَ بِالْحَرَامِ فَأَنَّى يُسْتَجَابُ لِذَلِكَ؟!» واته: «ئەی خەڵکینە، خوای گەورە پاک وپیرۆز (دوورە لە کەموکورتی) وهیچ شتێک قبوڵ ناکات مەگەر پاک نەبێت، وفەرمانی کردووە بە ئیمانداران هەروەکو چۆن فەرمانی کردووە بە پێغەمبەرانیش، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا، إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ} [المؤمنون: ٥١]، {ئەی نێردراوانی خودا لە خۆراکی پاک و(حەڵاڵ) بخۆن وکردەوەی چاک بکەن،چونکە بەڕاستی من بەوەی ئێوە دەیکەن زانام (ئاگادارم)}، وفەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ} [البقرة: ١٧٢]، واتە: {ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە بخۆن لەو خواردەمەنیە پاکانەی کردوومانە بە ڕۆزیتان وسوپاسی خودا بکەن ئەگەر ئێوە هەر ئەو دەپەرستن}، پاشان پێغەمبەر ﷺ باسی پیاوێکی کرد کە قژی گف وتێکچووە بە سەریەکدا وجلەکەی خۆڵ وتۆزاویە، ودەستی بەرز دەکاتەوە بەرەو ئاسمان، (ودەڵێت:) ئەی پەروەردگار (یا رب)، ئەی پەروەردگار (یا رب)، وخواردنەکەی حەرامە، وخواردنەوەکەی حەرامە، وجلەکەی بە پارە حەرام کڕیویەتی ولە بەریدایە، وخواردنی حەرامی پێدراوە، چۆن وەڵامی ئەو جۆرە کەسە دەدرێتەوە؟». [صحيح مسلم: ١٠١٥]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ} واتە: {(ئەی موحەممەد -صلى الله عليه وسلم-) بڵێ کێ ڕازاندنەوە وجوانی و (نازونیعمەتە) خواییەکانی حەرام کردووە کە خودا بۆ بەندەکانی دروستی کردووە هەروەها ڕۆزی وخۆراکە پاک وخۆشەکان (کێ حەرامی

کردوون) (ئەی موحەممەد -صلى الله عليه وسلم-) پێیان بڵێ: ئەوانە بـۆ بـڕوادارانە لە ژیانی دونیادا (بێباوەڕانیش لە پەنـای ئەوانـدا بەشـداری دەکەن)، بەڵام لە ڕۆژی دواییـدا تـایبەتە بە بـڕواداران بەم شـێوەیە ئایەتەکانمـان بـاس دەکەیـن وڕوونـی دەکەینەوە بۆ گەل وکۆمەڵێک کە دەزانن وتێدەگەن} [الأعراف:٣٢].

وئاینی ئیسلام شـتە پاکەکـانی حەڵاڵ کـردووە لە خـواردن وخواردنەوکـان وفەرمانی کردووە بە پاکژکردنەوەی دڵ ولاشە ومالْ، وهاوسەرگیری حەڵاڵکـردووە، و بەهەمان شێوە فەرمانی بە پێغەمـبەران کـردووە -علـيهم السـلام-، بـۆیە ئەوان تەنهـا فەرمانی شتی پاک بە خەڵکی دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًـا وَجَعَـلَ لَكُـمْ مِـنْ أَزْوَاجِكُـمْ بَنِـينَ وَحَفَـدَةً وَرَزَقَكُـمْ مِـنَ الطَّيِّبَـاتِ أَفَبِالْبَاطِـلِ يُؤْمِنُـونَ وَبِنِعْمَـتِ اللَّهِ هُـمْ يَكْفُـرُونَ} واتە: {وخـودا لە ڕەگەزی خۆتـان هاوسەری بۆ بەدی هێناون ولە ژن وهاوسەرەکانتان کوڕ ونەوەی بۆ فەراهەم هێنـاون وڕزق وڕۆزی پاک وخۆشی پێداون دەی ئایا ئەوان هەر بە ناهەق وبەتاڵ باوەڕ دێـنن وبە چاکە ونیعمەتەکانی خـودایش بێبـاوەڕ وسـپڵەن} [النحـل:٧٢]. وخـوای گەورە دەفەرموێت: {وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ (٤) وە پۆشاکت بە پـاك ڕابگـرە (٤) وَالرُّجْـزَ فَـاهْجُرْ (٥) بەردەوام بە لە وازهێنـــان لە بـــت پەرســـتی و گوناهەکـــان (٥)} [المـــدثر:٤-٥]. وپێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: (لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ. قَالَ رَجُلٌ: إِنَّ الرَّجُلَ يُحِبُّ أَنْ يَكُونَ ثَوْبُهُ حَسَنًا وَنَعْلُهُ حَسَنَةً قَالَ: إِنَّ اللهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ الْكِبْرُ بَطَرُ الْحَقِّ وَغَمْطُ النَّاسِ) واتە: («هەرکەسێک هێنـدەی کێشـی گەردیـلەک خـۆبەگەورەزانین لە نـاو دڵیـدا هەبێـت نـاچێتە بەهەشـتەوە»، پیاوێـک ووتـی: کەسـێک حەز دەکـات جـلەکەی ڕێکوپێـک بێـت، ونەعلەکەی ڕێکوپێک بێـت؟ -صـلى الـله علـيه وسـلم- فەرمـووی: «خـوای گەورە

جوانه، وجوانیشی خۆشدەوێت، خۆبەگەورەزانین: بریتیە لە ڕەتدانەوەی هەق وبە کەمزانینی خەڵکی -بە چاوی سووک سەیرکردنی خەڵکی-») [صحیح مسلم: ٩١].

**٣٤. وئاینی ئیسلام ئەو تاوانانەی حەرامکرد کە بە بنچینەی حەرامکراوەکان دادەنرێت وەکو: شیرک وهاوبەشدانان بۆ خودا وکوفر وبێباوەڕی، وبت پەرستی، وقسەکردن بەناوی خوداوە بە بێ زانست، وکوشتنی منداڵەکان، وکوشتنی ئەو نەفسانەی کە کوشتنیان حەرامکراوە، وخراپەکاری نانەوە لەسەر زەویدا، وتاوان وخراپە ئاشکرا ونهێنیەکان وزینا کردن ونێربازی، ومامەڵکردن بە ڕیبا (سوو)، وخواردنی گۆشتی ئاژەڵی مردارەوە بوو (جگە لە ئاژەڵانی نێو دەریا وکولە)، وخواردنی گۆشتی ئەو ئاژەڵەی بۆ -لەبەر- بتەکان وگۆڕەکان سەربڕاوە، خواردنی گۆشتی بەراز، وهەموو شتە پیس وبۆگەنەکان، وخواردنی ماڵی هەتیوەکان، وفێڵکردن لە تەرازوو وکێشان، وپچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی، وپێغەمبەران -علیهم السلام- کۆک ویەک دەنگن سەبارەت بە حەرامکردنی ئەم تاوانە حەرامکراوەکانە.**

ئاینی ئیسلام ئەو تاوانانەی حەرامکرد کە بە بنچینەی حەرامکراوەکان دادەنرێت وەکو: شیرک وهاوبەشدانان بۆ خودا وکوفر وبێباوەڕی، وبت پەرستی، وقسەکردن بەناوی خوداوە بە بێ زانست، وکوشتنی منداڵەکان، خوای گەورە دەفەرموێت: { قُلۡ تَعَالَوۡاْ أَتۡلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمۡ عَلَيۡكُمۡۖ أَلَّا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗاۖ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُم مِّنۡ إِمۡلَٰقٖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكُمۡ وَإِيَّاهُمۡۖ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ

مِنهَا وَمَا بَطَنَ وَلَا تَقتُلُواْ ٱلنَّفسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلحَقِّ ذَٰلِكُم وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُم تَعقِلُونَ (١٥١) (ئەی موحەممەد -صلى الله عليه وسلم-) بڵێ وەرن با بیخوێنمەوە (بۆتان) ئەوەی پەروەردگارتان (حەرام) و یاساغی کردووە لەسەرتان (فەرمانیداوە کەوا) هیچ شتێک نەکەن بە هاوبەش بۆی و لەگەڵ باوک و دایکدا ئاکار چاک و ڕەفتار جوان بن و منداڵەکانتان مەکوژن لەبەر هەژاری و نەبوونی ئێمە ڕۆزی ئێوە و ئەوانیش دەدەین ونزیکی گوناهـ و کردەوە بەدەکان مەکەونەوە ئەوەی بە ئاشکرا دەکرێت لەو (خراپانە) و ئەوەش بە پەنهان وئەو کەسە مەکوژن کە خوا کوشتنی حەرامکردووە مەگەر هەق بێت (و بکوژرێتەوە لە تۆڵەدا) خوا ئەمانەی بە ئێوە ڕاسپاردووە بۆ ئەوەی تێبگەن (و ژیری خۆتان بەکاربهێنن) (١٥١) وَلَا تَقرَبُواْ مَالَ ٱليَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحسَنُ حَتَّىٰ يَبلُغَ أَشُدَّهُۥ وَأَوفُواْ ٱلكَيلَ وَٱلمِيزَانَ بِٱلقِسطِ لَا نُكَلِّفُ نَفسًا إِلَّا وُسعَهَا وَإِذَا قُلتُم فَٱعدِلُواْ وَلَو كَانَ ذَا قُربَىٰ وَبِعَهدِ ٱللَّهِ أَوفُواْ ذَٰلِكُم وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُم تَذَكَّرُونَ (١٥٢) و نزیکی ماڵی هەتیوان مەکەونەوە مەگەر بەو شێوەی کەجوانتر و چاکتر بێت (بۆ ئەوان) تا باڵغ دەبێت و دەگاتە هێزی خۆی و پێوانە و کێشانە بێ زیاد و کەم ئەنجام بدەن بە دادگەری داوای هیچ ئەرک و فەرمانێک لەکەس ناکەین مەگەر بە ئەندازەی توانای خۆی نەبێت وکاتێک (بۆ شایەتیدان و شتی تر) قسەتان کرد دادوەر وڕاست بن با (لە دژی) خزمی نزیکی خۆشتان بێت وبەڵێن و پەیمانی خوا بە چاکی ببەنە سەر خوا ئەو شتانەی بە ئێوە ڕاسپاردووە بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە (١٥٢)} [الأنعام:١٥١-١٥٢]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالْإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَن تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ} واتە: {بڵێ بێگومان پەروەردگارم تەنها ئەو کردەوانەی حەرامکردووە کە زۆر بەد و خراپن ئەوانەی کە ئاشکران و ئەوانەش کە نهێنین وگوناهـ ودەست درێژی بەناهەقی (حەرامکردووە)،

و (حەرامی کـردووە) شـتێک بـکەنە هـاوبەش بـۆ خـوا کە بەڵـگەی بـۆ نەهـاتووە, و(حەرامی کردووە) کە بە ناوی خواوە شتانێک بڵێن کە نایزانن} [الأعراف:٣٣].

وئاینی ئیسلام کوشتنی ئەو کەسانەی حەرامکردووە کە کوشـتنیان حەرام ونەهی کراوە لە شەریعەتدا، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَلَا تَقتُلُواْ ٱلنَّفسَ ٱلَّتِي حَـرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلحَقِّ وَمَن قُتِلَ مَظلُومًا فَقَد جَعَلنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلطَٰنًا فَلَا يُسرِف فِّي ٱلقَتلِ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُـورًا} واتە: {وە کەسـێک مەکـوژن کە خـوا کوشـتنی حەرام کـردووە مەگەر بە (هۆیەکی) ڕاست و ڕەوا نەبێت (وەک ئەگەر هاتوو کەسێکی کوشتبوو، یان لە ئـاین پاشگەز ببووەوە، یان شووی کردبوو یان ژنی هێنابوو وزینایان کرد) جا هەرکەسێک بە نـاهەق و سـتەم لێکـراوی کـوژرا ئەوە دەسـەڵاتمان داوە بەخـاوەنەکەی (بەسـەر بکوژەکەدا) جا با خاوەنەکەی زیادەڕۆیی نەکات لە تۆڵەسەندنەوەدا (ئەگەر عەفووی کرد پاش ئەوە نەچێت تۆڵەی لێ بسەنێتەوە، وە ئەگەر کوشتیەوە بە جـوانترین شـێوە بیکوژێتەوە و ڕازی بێت بە بڕیـاری خـوا هەرچۆنێـک بێـت) چـونکە بەڕاسـتی ئەو (خاوەنە) یارمەتیدراوە} [الإسراء:٣٣]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُـونَ وَمَـن يَفْعَـلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا} واتە: {وە کەسانێکن کە لەگەڵ خوادا ناپەرستن هـیچ پەرسـتراوێکی تر و ناکوژن هیچ کەسێک کە خوا کوشـتنی ئەوی یاسـاغ و(حەرام) کـردووە مەگەر بەهەق و ڕەوا نەبێت وە زینا وداوێن پیسی ناکەن وە هەر کەسێک ئەو تاوانانە بکـات (کە باسکران) سزاکەی وەردەگرێت} [الفرقان:٦٨]. وئاینی ئیسـلام نـانەوەی ئـاژاوە وپشـێوەی وخراپەکـاری (فەسـادی) لەسـەر زەویـدا حەرامکـردووە، خـوای گەورە دەفەرموێـت: {وَلَا تُفْسِـدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْـدَ إِصْـلَاحِهَا} واتە: {خراپەکـاری مەکەن (مەنێنەوە) لەسەر زەویدا پاش ئەوەی کە خوا چاکی کردووە} [الأعراف:٥٦]. خـوای گەورە سەبارەت بە گفتوگۆی شوعەیب -علیه السلام- لەگەڵ قەومەکەی لە قورئـانی

پیرۆزدا دەفەرموێت: کە شوعەیب -علیه السلام- فەرموویەتی: {يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ قَدْ جَاءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ فَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ} واتە: {ئەی گەلەکەم بەتەنها خودا بپەرستن هیچ پەرستراوێکتان نییە بێجگە لە ئەو؛ بێگومان لە لایەن پەروەردگارتانەوە بەڵگە وموعجیزەیەکی ڕوون وئاشکراتان بۆ هاتووە کەواتە لە پێوانە وکێشانەتان دا ڕێک وڕاست بن ولە شتومەکی خەڵکی کەم مەکەنەوە (بە دزی) ولە زەویدا خراپەکاری مەنێنەوە (مەکەن) لە پاش چاکردنی ئەوەی باسکرا چاکترە بۆتان ئەگەر ئێوە ئیماندارن} [الأعراف: ٨٥].

وئاینی ئیسلام سیحر کردنی بە هەموو شێوەیەک لە شێوەکان حەرامکردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓاْ إِنَّمَا صَنَعُواْ كَيْدُ سَٰحِرٍ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ} واتە: {ئەوەی لەدەستی ڕاستتدایە (کە گۆچانەکەتە) فڕێی بدە هەرچی (جادوو) ئەوان کردوویانە قوتی دەدات (هەڵی دەلوشێت) بێگومان ئەوەی ئەوانە کردوویانە تەنها فڕوفێڵی جادووگەرە جادووگەریش سەرکەوتوو نابێت لەهەر کوێوە هاتبێت و(هەرچی بکات)} [طه:٦٩].
وپێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «اجْتَنِبُوا السَّبْعَ المُوبِقَاتِ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: الشِّرْكُ بِاللَّهِ وَالسِّحْرُ وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالحَقِّ وَأَكْلُ الرِّبَا وَأَكْلُ مَالِ اليَتِيمِ وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ وَقَذْفُ المُحْصَنَاتِ المُؤْمِنَاتِ الغَافِلَاتِ»واتە: «خۆتان بپارێزن لە حەوت تاوانە وێرانکەر و لەناوبەرەکە، ووتیا: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوانە چین؟ فەرمووی: شیرک وهاوبەشدانان بۆ خوای گەورە، وسیحرکردن، وکوشتنی نەفسێک کە خوای گەورە حەرامی کردووە بکوژرێت مەگەر بە هەق ومافی خۆی نەبێت، وخواردنی ڕیبا (سوو)، خواردنی ماڵی یەتیم، وڕاکردن لە ڕۆژی جیهاددا (پشتکردنە گۆڕەپانی جەنگ وڕاکردن)، وتۆمەتی زینا هەڵواسین

دژی ئافرەتە ئیمانداره داوێن پاکە بێئاگاکان*». *(بێئاگاکان: تاوانی بوهتانکردن دژی پیاوە ئیمانـداره داوێـن پاکەکـانیش دەگـرێتەوە، ولەوەیە هۆکـاری ئەوە بێـت لێـرەدا پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- باسی پیـاوی نەکـردووە چـونکە بە زۆری بوهتـانی داوێن پیسی دەدرێتە پاڵ ئافرەتان) [صحيح البخاري: ٦٨٥٧].

وئاینی ئیسلام تاوان وخراپەکارییە نهێنی وئاشکراکانی حەرامکـردووە وەکـو زینا ونێربازی وپێشووتر لە سەرەتای ئەم بڕگەیەدا ئەو ئایەتـانە باسـکرا کە بەڵـگەن لەسەر حەرامبوونی ئەم کارە قێزەوەنانە، وهەروەهـا ئـاینی ئیسـلام ڕیبـای (سـووی) حەرامکردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَذَرُوا مَا بَقِـيَ مِنَ الرِّبَا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ (٢٧٨) ئەی ئەو کەسـانەی بڕواتـان هێنـاوە (بە خـودا) لە خودا بترسن و وازبهێنن لە پاشماوەی ڕیبا (سوو) ئەگەر ئێوە بڕوادارن (٢٧٨) فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا فَأْذَنُوا بِحَرْبٍ مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْـوَالِكُمْ لَا تَظْلِمُـونَ وَلَا تُظْلَمُونَ (٢٧٩) واتە: ئەمجا ئەگەر دەستتان لێهەڵنەگرت کەواتە بـزانن وئاگـادار بـن جەنگ لەگەڵ خودا وپێغەمبەرەکەی ڕادەگەیەنن وئەگەر پەشیمان بوونەوە ئەوا تەنها سەرمایەکانتان بـۆ ئێـوەیە نە سـتەم بـکەن (لە خەڵکـی) ونە سـتەمتان لێـدەکرێت (٢٧٩)} [البقرة:٢٧٨-٢٧٩].

خوای گەورە هەڕەشەی جەنگی نەکردووە بەرامبەر تاوانەکانی تـر هێنـدەی هەڕەشە کردن بەرامـبەر ئەو کەسـەی مـامەڵە بە ڕیبـا (سـوو) ەوە دەکـات؛ چـونکە مـامەڵە کـردن بە ڕیبـا هۆکـاری تیـاچوونی دینـداری و وڵاتەکـان وپـارە وسـامان ونەفسەکانە. وئاینی ئیسلام خواردنەوەی گۆشتی ئاژەڵی مردارەوە بـوو وخـواردنەوەی خـوێن، وخـواردنی گۆشـتی بەراز وئەو گۆشـتانەی حەرامکـردووە کە بـۆ بتەکـان سەربڕدراون؛ لەگەڵ هەندێک گۆشتی تر کە لەم ئـایەتە پیـرۆزەدا باسـکراوە، خـوای گەورە دەفەرموێت: {حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِـهِ

وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ } واته: {لەسەرتان یاساغ کراوە -قەدەغە کراوە- (گۆشتی) مردارەوە بوو وخوێن وگۆشتی بەراز و ئەو ئاژەڵەی لەکاتی سەر بڕیندا ناوی جگە لە خوای لەسەر هێنرا بێت و ئاژەڵی خنکاو (و خنکێنراو) و ئەوەی کە لێی درابێت تا گیانی دەرچووبێت وئەوەی لە بەرزی کەوتبێتە خوارەوە ومرد بێت وقۆچ لێدراو (کە بەو قۆچ لێدانە مردبێت) وئەوەی دڕندە لێی خواردبێت بێجگە لە ئەوەی (پێش مردن) سەرتان بڕی بێت هەروەها (یاساغ کراوە لەسەرتان) ئەو ئاژەڵەی لەسەر نێب* یان لەو شوێنانەدا سەربڕابێت کە هانا وهاوار دەبن بۆ جگە لە خودا *(نێب: چەند بەردێک بوون لە دەوری کەعبە بەپیرۆز سەیر دەکران و لەلایاندا ئاژەڵیان سەر دەبڕی) و داواکردنی بەش بەخت (و نیاز گرتنەوە) بە تیروپشک (کە هەموو جۆرە یانیب وفڕێدانی زار وفاڵگرتنەوە وقاوە گرتنەوە وبورجەکان وهاوشێوەی ئەمانە دەگرێتەوە) (ئەنجامدانی) ئەمانە هەمووی لە فەرمان دەرچوون و تاوانە} [المائدة:٣].

وئاینی ئیسلام خواردنەوەی مەی (سەرخۆشکەرەکان) وهەموو شتە پیس وبۆگەنەکانی حەرامکردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (٩٠) ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بێگومان مەی (سەرخۆشکەرەکان) و قومار و ئەو بەردانەی کە کراون بە بت و ئەو پارچە دارانەی (کە بەکاردەهێنرێن بۆ دیاریکردنی بەش و چارەنووس) ئەوانە پیسن و لە کردەوەی شەیتانن کەواتە دوورکەونەوە لێی بۆ ئەوەی ڕزگارتان بێت (٩٠) إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ (٩١) بێگومان شەیتان هەر ئەوەی دەوێت کە دوژمنایەتی و کینە و ڕق بخاتە

نێوانتانەوە بەهۆی مەی (سەرخۆشکەرەکان) و قومارەوە وە ڕێگریتان بکات لە یادی خودا و لە نوێژ کردن دەی ئایا ئێوە وازدەهێنن (لەو خراپانە)؟ (٩١)} [المائـدة:٩٠-٩١].

وپێشتر ڕوونکـرایەوە لە بـڕگەی ژمـارە (٣١) کە خـوای گەورە باسـی ئەوە دەکـات لە سیفاتەکانی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- لە تەوراتدا ئەوەیە کە شتە پیسەکانیان لەسەر حەرام وقەدەغە دەکات، خوای گەورە دەفەرموێـت: {الَّـذِينَ يَتَّبِعُـونَ الرَّسُـولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنـدَهُمْ فِي التَّـوْرَاةِ وَالْإِنجِيـلِ يَـأْمُرُهُم بِـالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُـمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَـتْ عَلَـيْهِمْ} واتە: {(ئەم ڕەحـمەتەی پەروەردگـار) بـۆ ئەوانەیە کە شوێن (پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم-) دەکەون کە پێغەمبەرێکی نەخوێنـدەوارە و (لەلایەن پەروەردگارەوە هاتووە) ئەو کەسە (پێغەمبەرێکە ئەهلی کتێب سیفەتەکانی دەزانن ودەیناسن) چونکە بە نووسراوی لایانە لە تەورات و ئینجیلـدا کە فەرمانیـان پێ دەکات بە چاکە و ڕێگرییان لێ دەکـات لە خـراپە وشـتە پاکەکانیـان بـۆ حەڵاڵ دەکات وشتە پیسەکانیان لێ حەرام (قەدەغە) دەکات و بارە قـورس وگرانەکـان وئەو کۆت و زنجیرانەش کە بەسەریانەوە بوون لەسەریان لای دەبات} [الأعراف:١٥٧].

وئاینی ئیسلام خواردنی ماڵی هەتیو (یەتیمی) حەرامکردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَآتُوا الْيَتَامَىٰ أَمْوَالَهُمْ ۖ وَلَا تَتَبَدَّلُوا الْخَبِيثَ بِالطَّيِّبِ ۖ وَلَا تَأْكُلُوا أَمْـوَالَهُمْ إِلَىٰ أَمْوَالِكُمْ ۚ إِنَّهُ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا} واتە: {بیدەنەوە بە هەتیوان (دوای باڵغ بونیان) مـاڵ و سـامانیان وە پـیس (لە مـاڵی خۆتـان) مەگـۆڕنەوە بە پـاک (لە مـاڵی ئەوان) وە ماڵەکانیـان مەخـۆن لەگەڵ ماڵەکـانی خۆتـان بێگومـان ئەو خـواردنە گونـاهێکی گەورەیە} [النساء:٢]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {إِنَّ الَّذِينَ يَـأْكُلُونَ أَمْـوَالَ الْيَتَـامَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا ۖ وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا} واتە: {بەڕاستی ئەو کەسانەی کە

ماڵی هەتیوەکان دەخۆن بەستەم و ناڕەوا بەڕاستی ئەوانە بەس لە سکی خۆیان ئاگر دەخۆن. وە لەمەوپاش دەچنە ئاگرێکی بەتین و هەڵگیرساوەوە} [النساء:١٠].

وئاینی ئیسلام فێڵکردنی لە کێشان وتەرازوودا حەرامکردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ (١) هاوار وتیاچوون بۆ تەرازوو بازان (١) الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ (٢) ئەوانەی کە کاتێك پێوانە بکەن (بۆ خۆیان) لەسەر (ماڵی) خەڵکی بەتەواوی وەریدەگرن (٢) وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ (٣) بەڵام کاتێك بۆیان پێوانە یان کێشانە بکەن کەمیان پێدەدەن (٣) أَلَا يَظُنُّ أُولَٰئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ (٤) ئایا ئەوانە نازانن کە بێگومان زیندوو دەکرێنەوە؟! (٤) [المطففين:١-٤]. وئاینی ئیسلام پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی حەرامکردووە وپێشتر باسی ئەمە کرا لە برگەی ژمارە (٣١) وئەو ئایەت وفەرموودانەش باسکرا لەسەر ئەم بابەتە، وپێغەمبەران -علیهم السلام- هەموویان کۆکن لەسەر حەرامکردنی ئەم قەدەغەکراوانە.

## ٣٥. ئاینی ئیسلام بە شێوەیەکی گشتی نەهی لە هەموو ڕەوشتێکی خراپ وناشیرین دەکات وەکو درۆ وفێڵ وستەم وخیانەت و(پیلانگێڕی شەڕ وخراپە) ودزی وستەم ودەستدرێژی وهەموو ڕەوشتێک چەوت وپیس وبۆگەنی تر.

ئاینی ئیسلام بە شێوەیەکی گشتی نەهی لە ڕەوشتە خراپ وناشیرینەکان دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَلَا تُصَعِّر خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمشِ فِي ٱلأَرضِ مَرَحًا إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُختَالٖ فَخُورٖ} واتە: {ڕوو لە خەڵك وەرمەگێڕە وبە فیزەوە مەڕۆ بە سەر زەویدا چونکە بەڕاستی خوا هیچ خۆبەزلزان وشانازیکەرێکی خۆشناوێت}

[لقمان:١٨]. پێغەمبەری -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «إنَّ مـن أحـبِّكم إليَّ ، وأقربِكم مني مجلسًا يومَ القيامةِ أحاسِنُكم أخلاقًا ، وإنَّ أبغضَكم إليَّ وأبعـدَكم منـي مجلسًـا يـومَ القيامـةِ الثَّرثـارونَ ، والمُتشـدِّقونَ ، والمُتفيهقـونَ ، قـالوا : قـد علِمْنـا الثرثارونَ و المتشدِّقونَ ، فما المتفيهقـونَ ؟ قـال : المُتكـبِّرونَ» واته: «ئەو کەسـەی لە لای من خۆشەویستترە ولە دانیشتنی من نزیکترە لە ڕۆژی قیامەتدا -لە بەهەشتدا-؛ ئەو کەسەتانە کە جوانترین ڕەوشتی هەیە، وئەوەی زیاتر ڕقم لێیەتـی ولە دانیشـتنی من دوورتر دەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا (ئەم جۆرە کەسانەن): [سەرسارەکان] ئەوانەی زۆر قسە دەکەن -بە بێ سوود-، و [موتەشـەدیقەکان] ئەوانەی قسـە فـراوان وقـووڵ دەکەن بە ناهەق (بۆ گاڵتە کـردن بە خەڵکـی)، و[موتەفەیقیهەکـان]» ووتیـان: ئەی پێغەمـــبەری خـــودا [سەرســـارەکان] و[موتەشـــەدیقەکانمان] زانـــی، ئەی [موتەفەیقیهەکـــان] کـــێن؟، -صـــلى الـــلە علـــيه وســـلم- فەرمـــووی: «ئەوانەی خۆبەگەورەزانن». [السلسلة الصحيحة: ٧٩١].

ئیسلام نەهی دەکات لە درۆکـردن، خـوای گەورە دەفەرموێـت: {إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُـوَ مُسۡرِفٞ كَـذَّابٞ} واتە: {بێگومـان خـوا ڕێنمـونی کەسـێک ناکـات کە زێدەڕۆ و درۆزن بێت} [غـافر:٢٨]. وپێغەمـبەری خـودا -صـلى الله عليـە وسـلم- دەفەرموێت: «وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ فَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ وَإِنَّ الْفُجُـورَ يَهْـدِي إِلَى النَّارِ وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَكْذِبُ وَيَتَحَرَّى الْكَـذِبَ حَتَّـى يُكْتَـبَ عِنْـدَ اللهِ كَـذَّابًا» واتە: «وئاگـاداری درۆ کـردن بـن، چـونکە درۆ کـردن ڕێنیشـاندەرە بەرەو خراپەکـاری، وخراپەکـاری ڕێنیشـاندەرە بەرەو دۆزەخ، وکەسـێک درۆزنە وبەردەوام بەدوای درۆدا دەگەڕێت؛ هەتا لای خـوای گەورە بە درۆزن لە قەڵەم دەدرێـت». [صـحیح مسـلم: ٢٦٠٧]. وپێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «آيَةُ المُنَـافِقِ ثَـلاَثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ» واتە: «نیشانەکانی کەسی مونـافیق

(دوو ڕوو) سیانن: ئەگەر قسە بکات؛ درۆ دەکات، وئەگەر پەیمان بدات؛ پەیمانەکە دەشکێنێت، وئەگەر سپاردەیەکی (ئەمانەتێکی) پێ بسپێردرێت؛ خیانەت لە پاراستنی سپاردەکە دەکات». [صحيح البخاري: ٦٠٩٥].

ئاینی ئیسلام نەهی لە غەش وفێڵکردن دەکات، ولە فەرموودەیەکدا هاتووە: «أن رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ عَلَى صُبْرَةِ طَعَامٍ فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِيهَا فَنَالَتْ أَصَابِعُهُ بَلَلًا فَقَالَ: «مَا هَذَا يَا صَاحِبَ الطَّعَامِ؟» قَالَ أَصَابَتْهُ السَّمَاءُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ قَالَ: أَفَلَا جَعَلْتَهُ فَوْقَ الطَّعَامِ كَيْ يَرَاهُ النَّاسُ مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنِّي» واتە: «پێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- بە لە لای هەندێک خۆراکی دانراودا تێپەڕ بوو ودەستی خستە نێو خۆراکەکەوە ودەستی تەڕی بەرکەوت، وفەرمووی: «ئەمە چییە ئەی خاوەنی خۆراکەکە -فرۆشیاری خۆراکەکە-؟» ووتی: ئەمە باران لێی داوە ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی: «ئەی بۆچی نایکەیتە سەرەوەی خۆراکەکە بۆ ئەوەی خەڵکی بیبینێت، ئەوەی فێڵ -غەش- بکات لە من نییە» [صحيح مسلم: ١٠٢].

ئاینی ئیسلام نەهی لە ناپاکی وخیانەتکاری وفێڵکردن دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَخُونُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُوا أَمَانَاتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ } واتە: {ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ناپاکی مەکەن لەگەڵ خودا و پێغەمبەردا -صلى الله عليه وسلم- وناپاکی مەکەن لە سپاردەکانی ناو خۆتان لە کاتێکدا کە ئێوە دەزانن (ناپاکیە)} [الأنفال:٢٧]. وهەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: { ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ} واتە: {ئەوانەی کە پەیمانی خودا دەبەنە سەر وبەڵێن ناشکێنن وهەڵی ناوەشێننەوە} [الرعد:٢٠]. وئەگەر سوپاکان دەربچوونایە بۆ جیهاد کردن؛ پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- پێیانی دەفەرموو: «اغْزُوا وَلَا تَغُلُّوا وَلَا تَغْدِرُوا وَلَا تَمْثُلُوا وَلَا تَقْتُلُوا وَلِيدًا» واتە: «غەزا (هەڵمەتی ڕزگاری کردن) ئەنجامبدەن، ودزی مەکەن لە دەستکەوتەکانی جەنگ،

وخیانەت مەکەن، ولاشەی مردووەکان مەشێوێنن، ومنداڵەکان مەکوژن» [صحيح مسلم: ١٧٣١]. وپێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا خَالِصًا وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ حَتَّى يَدَعَهَا: إِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ وَإِذَا حَدَّثَ كَذَبَ وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ» واتە: «هەرکەسێک ئەم چوار سیفەتەی تێدا بێت ئەوا مونافیقێکی (دوو ڕوویەکی) تەواوە، و هەرکەسێک یەکێک لەم سیفەتانەی تێدا بێت ئەوا سیفاتێکی مونافیقێتی تێدایە هەتاوەکو وازی لێدەهێنێت -واز لەم سیفەتە ناشیرینە دەهێنێت-: (سیفەتەکان): ئەگەر سپاردەی (ئەمانەتی) پێ بسپێردرێت خیانەتی لێدەکات، وئەگەر قسە بکات درۆ دەکات، وئەگەر پەیمان بدات دەیشکێنێت وخیانەت دەکات، وئەگەر تووشی گفتوگۆ وناکۆکی ببێت ئەوا لە ڕاستی لادەدات -ستەم لە بەرامبەر دەکات-» [صحيح البخاري: ٣٤]،

ئاینی ئیسلام نەهی دەکات لە حەسوودی (ئیرەیی)، خوای گەورە دەفەرموێت: {أَمْ يَحْسُدُونَ النَّاسَ عَلَىٰ مَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ ۖ فَقَدْ آتَيْنَا آلَ إِبْرَاهِيمَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَاهُم مُّلْكًا عَظِيمًا} واتە: {یان ئیرەیی (حەسوودی) دەبەن بە خەڵکی؟ لەسەر ئەوەی خوا پێی بەخشیوون (کە پێغەمبەرێتیە) لە فەزڵ و بەهرەی خۆی ئەوە بێگومان داومانە بە نەوەی ئیبراهیم کتێب و پێغەمبەرێتی هەروەها پێمان بەخشین دەسەڵاتێکی گەورە} [النساء:٥٤]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ ۖ فَاعْفُوا وَاصْفَحُوا حَتَّىٰ يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ} واتە: {زۆر لە خاوەن کتێبەکان (گاوڕ وجولەکەکان) ئاواتە خوازن کە ئێوە بێباوەڕ بن، دوای باوەڕ هێنانتان لەبەر حەسودییەک کە لە دەرونیانەوەیە (ئەمەش) دوای ئەوەی کە ڕاستیەکەیان بۆ ڕوون بووەتەوە بەڵام ئێوە لێیان خۆش بن و چاو پۆشیان

لێ بکەن تا خوا فەرمانی خۆی دەنێرێت بێگومان خـوا بە دەسـەڵاتە بەسـەر هەمـوو شتێکدا} [البقرة:١٠٩]. وپێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «دَبَّ إِلَيْكُمْ دَاءُ الأُمَمِ قَبْلَكُمْ: الحَسَدُ وَالبَغْضَاءُ هِيَ الحَالِقَةُ لَا أَقُولُ تَحْلِـقُ الشَّـعَرَ وَلَكِـنْ تَحْلِقُ الدِّينَ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا تَدْخُلُوا الجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَـابُّوا أَفَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِمَـا يُثَبِّـتُ ذَلِـكَ لَكُـمْ؟ أَفْشُـوا السَّـلَامَ بَيْـنَكُمْ» واتە: «دەرد ونەخۆشـی ئومەتەکانی پێشووتر بەرەبەرە خۆی دەخشێنێت بەرەو لاتان: حەسوودی ورِق لێبوون -کینەیی- ئەمە تاشێنەرە ناڵێم موو دەتاشێت بەڵکو دینداری دەتاشێت -نایهێڵێـت-، سوێند بە ئەو زاتەی نەفسی من بەدەستە ناچنە بەهەشتەوە هەتاوەکو ئـیمان (بـاوەڕ) نەهێنن وئیمان ناهێنن هەتاوەکو یەکترتان خۆش نەوێت، ئایا شتێکتان پـێ بڵـێم کە ئەمە دەهێنێـتە دی وجێگیـری دەکـات؟ سـەلامکردن لە نێوانتانـدا بـڵاو بـکەنەوە» [سنن الترمذي: ٢٥١٠].

ئـاینی ئیسـلام نەهـی دەکـات لە پیلانـی شـەڕ وخـراپ، خـوای گەورە دەفەرموێت: {وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَابِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُوا فِيهَا ۖ وَمَـا يَمْكُـرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِـهِمْ وَمَـا يَشْـعُرُونَ} واتە: {بەو شـێوەیە لە هەمـوو شـارێکدا گەورەترینـی تاوانباریمان کرد (بە دەسەڵاتدار) بۆ ئەوەی پیلان و فێڵ بکەن لەو شارانەدا وە فێـڵ وپـیلان نـاکەن (لە کەس) بـێجگە لە خۆیـان بەڵام ئەوان هەسـتی پـێ نـاکەن} [الأنعام:١٢٣]. وخوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە جولەکەکان هەوڵیاندا بـۆ ئەوەی مەسیح (عیسا) -علیـە السـلام- بکـوژن وپیلانیـان بـۆی گێـڕا؛ بەڵام خـوای گەورە پیلانی بۆ ئەوان دانا، خوای گەورە ڕوونیکـردەوە کە پیلانـی شـەڕ وخـراپە تەنهـا بـۆ پیلاندارێژەرەکە دەگەڕێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێـت: {فَلَـمَّا أَحَـسَّ عِيسَىٰ مِـنْهُمُ الْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِي إِلَى اللَّهِ ۖ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ اللَّهِ آمَنَّا بِاللَّهِ وَاشْـهَدْ بِأَنَّـا مُسْلِمُونَ (٥٢) ئەمجا کاتێک کە عیسا هەستی کرد بە بێباوەڕی گەلەکەی ووتی: کێ

لەگەڵ مندا دینی خوا سەردەخات هاوەڵانی (حەوارییەکانی) ووتیان ئێمە سەرخەری ئاینی خوداین بڕوامان بە خوا هێناوە و تۆ ئەی عیسا شاهێد بە کە ئێمە گوێڕایەڵ وملکەچی ئەوین (٥٢) رَبَّنَا آمَنَّا بِمَا أَنزَلْتَ وَاتَّبَعْنَا الرَّسُولَ فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ (٥٣) ئەی پەروەردگارمان ئێمە باوەڕمان هێنا بەوەی کە ناردووتەتە خوارەوە, وە شوێنکەوتەی پێغەمبەری تۆین؛ خوایە ناومان بنووسە (بمانژمێرە) لەگەڵ بڕوادارانی (یەکتاپەرست) دا (٥٣) وَمَكَرُوا وَمَكَرَ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ (٥٤) (جولەکەکان) پیلانیان گێڕا (بۆ کوشتنی عیسا) خوداش لە بەرانبەردا پیلانی لێ گێڕان وە خواش چاکترین پیلان گێڕە (لە بەرانبەر پیلان گێڕاندا بۆ پووچەڵکردنەوەی فڕوفێڵەکانیان) (٥٤) إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَىٰ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَجَاعِلُ الَّذِينَ اتَّبَعُوكَ فَوْقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ (٥٥) (بیهێنەرەوە یادت) کاتێک خوا فەرمووی ئەی عیسا من تۆ دەبەمەوە و بەرزت دەکەمەوە بۆ لای خۆم وە پاک کەرەوەی تۆم لە (هاودەمی) ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون وە پەیڕەوانی (ڕاستەقینەی) تۆ بەرز دەکەمەوە بەسەر بێبڕواییاندا هەتا ڕۆژی دوایی پاشان گەڕانەوەتان بۆ لای منە ئەمجا بڕیار دەدەم لە نێوانتاندا لەو شتانەی کە تیایاندا جیاواز وناکۆکن (٥٥)} [آل عمران:٥٢-٥٥]. وخوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە قەومی پێغەمبەر ساڵح -عليه السلام- پیلانیان بۆی دانا و ویستیان بیکوژن بەڵام خوای گەورە پیلانی بۆ ئەوان دانا و لەناویانی برد وهەموو قەومەکە تیاچوون، خوای گەورە دەفەرموێت: {قَالُوا تَقَاسَمُوا بِاللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُ وَأَهْلَهُ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِ وَإِنَّا لَصَادِقُونَ (٤٩) ووتیان (بە یەکتری) سوێند بخۆن بە خوا کە بە شەودا هێرش دەکەینە سەر ماڵ و خێزانی (ساڵح و هەموویان لەناو دەبەین) لە پاشان دەڵێین بە کەسوکاری (ساڵح) ئێمە ئاگامان لە کوشتن و تیاچوونی خێزانی ئەو نییە وبێگومان ڕاستیش دەکەین (٤٩) وَمَكَرُوا مَكْرًا وَمَكَرْنَا

مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ (٥٠) ئەوان پیلانی نەخشەیان دارِشت بە پیلانـدانێکی خـراپ (بۆ کوشتنی ساڵح) ئێمەش (لە بەرامبەر پیلانی ئەوانـدا) پیلانمـان گێـڕا (بـۆ لەنـاو بردنیان) بە پیلانگێڕانێکی بەهێز لە کاتێکـدا ئەوان هەسـتیان نەدەکـرد (٥٠) فَـانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَـةُ مَكْـرِهِمْ أَنَّـا دَمَّرْنَـاهُمْ وَقَـوْمَهُمْ أَجْمَعِـينَ (٥١) ئەمجـا سـەرنج بـدە سەرەنجامی پیلانـی ئەوان چـی لێهـات چـۆن ئـێمە ئەوان وقەومەکەیانمـان هەمـوو پێکەوە لەناو برد (٥١)} [النمل:٤٩-٥١].

ئاینی ئیسلام نەهی دەکات لە دزی کـردن، پێغەمـبەری خـودا -صـلی الـلە علیە وسلم- دەفەرموێت: «لاَ يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ وَلاَ يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ وَلاَ يَشْرَبُ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ وَالتَّوْبَةُ مَعْرُوضَةٌ بَعْـدُ»واتە: «زینـاکەر کاتێک زینا دەکات ئیماندار نیـیە، ودز کاتێـک دزی دەکـات ئیمانـدار نیـیە، ومەی خۆر -ئارەق خۆر- ئیماندار نییە لە کـاتی مەی -سەرخۆشـکەر- خـواردنەوە، بەڵام لە پاشـاندا -لە پـاش ئەم تاوانـانە- دەرفەت هەیە بـۆ تەوبە کـردن» [صـحیح البخـاري: ٦٨١٠].

ئاینی ئیسلام نەهی دەکات لە ستەمکردن، خـوای گەورە دەفەرموێـت: {إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَـاءِ وَالْمُنكَـرِ وَالْبَغْـيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ}-واتە: {بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بە دادگەری و بە چـاکە و بە بەخشین بە خزم و خوێش وە (خوا) ڕێگری دەکات لە داوێن پیسـی و خـراپە و دەستدرێژی ئامۆژگاریتان دەکات بۆ ئەوەی پەند وەرگرن و بیربکەنەوە} [النحل:٩٠]. وپێغەمـبەری خـودا -صـلی الله علیـە وسـلم- دەفەرموێـت: «إنَّ الله أوحـى إليَّ أن تَواضَعُوا حتى لا يَبغِي أحدٌ على أحدٍ ولا يفخَرَ أحـدٌ عـلى أحـدٍ»واتە: «خـوای گەورە وەحی بۆ ناردووم بەوەی کە سادە بن (-متواضع- بن) بۆ ئەوەی هیچ کەسـێک سـتەم

له کەسێکی تر نەکات وهیچ کەسێک شانازی بەسەر کەسێکی ترەوە نەکات». [صحيح أبي داود: ٤٨٩٥].

ئاینی ئیسلام نەهی دەکات لە ستەمکردن، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ} واتە: {بێگومان خوا ستەمکارانی خۆش ناوێت} [آل عمران:٥٧]. وهەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: {إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ} واتە: {بەڕاستی ستەمکاران ڕزگاریان نابێت} [الأنعام:٢١]. وهەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: {وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمَۢا} واتە: {وە ئامادەی کردووە بۆ ستەمکاران سزای سەخت} [الإنسان:٣١]. وپێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «ثَلَاثَةٌ لَا تُرَدُّ دَعْوَتُهُمْ: الْإِمَامُ الْعَادِلُ وَالصَّائِمُ حَتَّى يُفْطِرَ وَدَعْوَةُ الْمَظْلُومِ تُحْمَلُ عَلَى الْغَمَامِ وَتُفْتَحُ لَهَا أَبْوَابُ السَّمَاوَاتِ وَيَقُولُ الرَّبُّ عَزَّ وَجَلَّ: وَعِزَّتِي لَأَنْصُرَنَّكَ وَلَوْ بَعْدَ حِينٍ» واتە: «سێ چین نزاکانیان ڕەت ناکرێتەوە: پێشەوایەکی (دەسەڵاتدارێکی) دادپەوەر، وکەسی ڕۆژووگر هەتاوەکو ڕۆژووەکەی دەشکێنێت، ونزای ستەملێکراو کە نزاکەی لەسەر هەورەکان هەڵدەگیرێت ودەرگاکانی ئاسمانی بۆ دەکرێتەوە وپەروەردگاری بەرز وشکۆدار دەفەرموێت: سوێند بە عیزەت وشکۆداریم سەرت دەخەم ئەگەر پاش ماوەیەکیش بێت». [أخرجه مسلم: (٢٧٤٩)، والترمذي: (٢٥٢٦)، وأحمد: (٨٠٤٣)]. وکاتێک پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- موعازی نارد بۆ یەمەن، پێی فەرموو: «وَاتَّقِ دَعْوَةَ المَظْلُومِ فَإِنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ» واتە: « وئاگاداری نزای ستەملێکراو بە چونکە لە نێوان ئەو وخوادا هیچ پەردەیەک نییە». [صحيح البخاري: ١٤٩٦]، وپێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «أَلَا مَن ظَلم مُعاهِداً أو انتَقصَهُ أو كلَّفَهُ فوقَ طاقَتِه أو أخَذ منهُ شيئاً بِغيرِ طِيبِ نَفسٍ فأنا حَجيجُهُ يوم القيامةِ» واتە: «هەرکەسێک ستەم لە پەیمانپێدراوێک -موعاهیدێک- بکات یان مافی بخوات یان ئەرکێک بخاتە سەری کە لە توانایدا نەبێت یان شتێکی

لێ ببات به بێ ئەوەی خۆی ڕازی بێت؛ ئەوا من ڕووبەڕووی ئەو کەسە دەوەستمەوە لە ڕۆژی قیامەتدا» [سنن أبي داود: ٣٠٥٢]. ئاینی ئیسلام نەهی دەکات لە هەموو ڕەوشتێکی ناشیرین وپیس وخراپ وهەروەها نەهی دەکات لە هەموو مامەڵەیەکی ستەمکارانە.

## ٣٦. ئاینی ئیسلام نەهی دەکات لەو مامەڵە داراییانەی کە ڕیبا (سوو) یان زیان یان ستەم یان فێڵ یان هۆکارە بۆ تووشبوون بە زیان وکارەساتی گشتی بۆ سەر کۆمەڵگا وگەل وتاکەکان.

ئاینی ئیسلام نەهی دەکات لەو مامەڵە داراییانەی کە ڕیبا (سوو) یان زیان یان ستەم یان فێڵ یان هۆکارە بۆ تووشبوون بە زیان وکارەساتی گشتی بۆ سەر کۆمەڵگا وگەل وتاکەکان. وپێشتر ئەو ئایەت وفەرموودانە باسکرا کە ڕیبا وستەم وفێڵکردن -غەش- وخراپەکانی نانەوە لەسەر زەویدا حەرام دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُّبِينًا} واتە: {وکەسانێك کە ئازاری پیاوان وئافرەتانی ئیماندار دەدەن بە بێ ئەوەی هیچ تاوانێکیان کردبێت ئەوە بەڕاستی ئەوانە بوهتان وتاوانێکی ئاشکرایان گرتۆتە ئەستۆ} [الأحزاب:٥٨]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {مَّنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاءَ فَعَلَيْهَا وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ} واتە: {هەرکەسێك کاری چاکە بکات (قازانجەکەی) بۆ خۆیەتی هەر کەسیش خراپە بکات (زیانەکەی) بۆ خۆیەتی وپەروەردگارت ستەم لە بەندەکانی ناکات} [فصلت:٤٦]. ولە سونەتدا هاتووە: «پێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- بڕیار وحوکمی داوە لەسەر ئەوەی: « لَا ضَرَرَ وَلَا ضِرَارَ» واتە: «زیان بە خۆتان و بە یەکتر مەگەیەنن، جا بە ئەنقەست یان

بەبێ ئەنقەست بێت» [سنن أبي داود]، وپێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: (مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يُؤْذِ جَارَهُ وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَسكت. وفي روايةٍ: فَلْيُحْسِنْ إلى جارِهِ) واتە: (ئەوەی باوەڕی بە خودا وڕۆژی دوایی هەیە؛ ئەوا با ڕێز لە دراوسێکەی بگرێت، ئەوەی باوەڕی بە خودا وڕۆژی دوایی هەیە؛ ئەوا با ڕێز لە میوانەکەی بگرێت، ئەوەی باوەڕی بە خودا وڕۆژی دوایی هەیە؛ ئەوا با قسەی خێر بکات یان بێدەنگ بێت، ولە گێڕانەوەیەکدا: -ئەوەی باوەڕی بە خودا وڕۆژی دوایی هەیە-؛ ئەوا با چاکەکار بێت بەرامبەر دراوسێکەی) [صحيح مسلم: ٤٧]. وپێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «عُذِّبَتِ امْرَأَةٌ فِي هِرَّةٍ سَجَنَتْهَا حَتَّى مَاتَتْ فَدَخَلَتْ فِيهَا النَّارَ لَا هِيَ أَطْعَمَتْهَا وَسَقَتْهَا إِذْ هِيَ حَبَسَتْهَا وَلَا هِيَ تَرَكَتْهَا تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الْأَرْضِ»واتە: «ئافرەتێک سزا درا وچووە دۆزەخەوە بەهۆی پشیلەیەکەوە چونکە بەندی دەکرد هەتاوەکو پشیلەکە مرد، نە خواردن وخواردنەوەی پێدا ونە هێشتی بۆ خۆی لە شتی سەر زەوی بخوات». [صحيح البخاري: ٣٤٨٢].

ئەمە سزای کەسێکە کە ئازاری پشیلەیەک بدات؛ ئەی چی سەبارەت بە کەسێک کە ببێتە هۆی ئازاردنی خەڵکی بێ تاوان، ئیبن عومەر -ڕەزای خوایان لێبێت- دەڵێت: پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- چووە سەر مینبەر وبە دەنگێکی بەرز قسەی کرد، وفەرمووی: «يَا مَعْشَرَ مَنْ أَسْلَمَ بِلِسَانِهِ وَلَمْ يُفْضِ الإِيمَانُ إِلَى قَلْبِهِ لاَ تُؤْذُوا الْمُسْلِمِينَ وَلاَ تُعَيِّرُوهُمْ وَلاَ تَتَّبِعُوا عَوْرَاتِهِمْ فَإِنَّهُ مَنْ تَتَبَّعَ عَوْرَةَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ تَتَبَّعَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ وَمَنْ تَتَبَّعَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ يَفْضَحْهُ وَلَوْ فِي جَوْفِ رَحْلِهِ قَالَ: وَنَظَرَ ابْنُ عُمَرَ يَوْمًا إِلَى البَيْتِ أَوْ إِلَى الكَعْبَةِ فَقَالَ: مَا أَعْظَمَكِ وَأَعْظَمَ حُرْمَتَكِ وَالمُؤْمِنُ أَعْظَمُ حُرْمَةً عِنْدَ اللهِ مِنْكِ» واتە: «ئەی ئەوانەی کە بە زمان مسوڵمان بوون وئیمان نەچوونە نێو

دڵتــان؛ ئــازاری مســوڵمانان مەدەن وجنێویــان پــێمەدەن وشــوێنی کەموکــورتی وعەیبەکانیان مەکەون چونکە ئەوەی شوێنەی عەیبە وکەموکورتی بـرای مسـوڵمانی ئەوا خودا شوێنی عەیبەی ئەو دەکەوێت وئەوەیشی خودا شوێنی عەیـبەی بکەوێـت ئەوا ئابڕووی دەبات ئەگەر لە نێو ماڵەکەی خۆیشیدا بێت»، گێڕەرەوەی فەرمـوودەکە دەڵێت: ڕۆژێکیان ئیبن عومەر سەیری کەعـبەی کـرد و ووتـی: «چەنـدێک مەزنـی وچەنـدێک وڕێزلێگیراویـت بەڵام ئیمانــدار ڕێـزی لە تـۆ گەورەتـرە لە لای خـودا» [أخرجه الترمذي: (٢٠٣٢)، وابـن حبـان: (٥٧٦٣)]. وپێغەمـبەری خـودا -صـلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: (مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يُؤْذِ جَارَهُ وَمَـنْ كَـانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْـمُتْ) واتە: (ئەوەی بـاوەڕی بە خـودا وڕۆژی دوایـی هەیە؛ ئەوا بـا ئـازاری دراوسـێکەی نەدات، ئەوەی بـاوەڕی بە خـودا وڕۆژی دوایـی هەیە؛ ئەوا بـا ڕێـز لە میوانەکەی بگرێت، ئەوەی باوەڕی بە خودا وڕۆژی دوایی هەیە؛ ئەوا با قسەی خێـر بکات یان بێدەنگ بێت). [صحيح البخاري: ٦٠١٨]، «وعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: " هَلْ تَدْرُونَ مَنِ الْمُفْلِسُ؟ " قَالُوا: الْمُفْلِسُ فِينَا يَـا رَسُـولَ اللهِ مَنْ لَا دِرْهَمَ لَهُ وَلَا مَتَاعَ. قَالَ: " إِنَّ الْمُفْلِسَ مِنْ أُمَّتِي مَنْ يَـأْتِي يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ بِصِـيَامٍ وَصَلَاةٍ وَزَكَاةٍ وَيَأْتِي قَدْ شَتَمَ عِرْضَ هَذَا وَقَذَفَ هَذَا وَأَكَلَ مَالَ هَذَا فَيُقْعَدُ فَـيَقُصُّ هَـذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ وَهَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ فَإِنْ فَنِيَتْ حَسَنَاتُهُ قَبْلَ أَنْ يَقْضِيَ مَا عَلَيْهِ مِنَ الْخَطَايَا أُخِذَ مِنْ خَطَايَاهُمْ فَطُرِحَتْ عَلَيْهِ ثُمَّ طُرِحَ فِي النَّارِ» واتە: «لە ئەبـی هـورەیرەوە -ڕەزای خوای لێبێت- کە پێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «ئایا دەزانن کەسی مایەپووچ (موفلیس) کێیە؟»، ووتیان: کەسی مـایەپووچ لە نێوانمانـدا ئەوەیە کە هیچ پارە ومولکێکی نییە. -صلى الله عليه وسلم- فەرمووی: «کەسـی مـایەپووچ (موفلیس) ئەو کەسەیە لە نێـو ئـومەتەکەم کە ڕۆژی قیـامەت دێـت ونـوێژ وڕۆژوو

وزەکاتی ئەنجامـداوە، بەڵام بە نـاهەق: جـوێنی داوە، وتـۆمەتی هەڵواسـیوە، وپـارەی خەڵکی خەڵکی خواردووە، وخوێنی خەڵکـی ڕشـتووە، ولە خەڵکـی داوە، ئەوانەی ستەمی لێیان کردووە لە چاکەکانی دەدرێت پێیان. کاتێـک چـاکەی نامێنیـت پـێش ئەوەی دادەپەروەری بە تەواوی جێبەجێبکرێت خراپەکانی ئەو سـتەملێکراوانە فـڕێ دەدرێـتە سـەری، پاشـان فـڕێ دەدرێـتە نێـو دۆزەخ». [أخرجـه مسـلم: (٢٥٨١)، والترمذي: (٢٤١٨)، وأحمد: (٨٠٢٩)]. پێغەمـبەری خـودا -صـلى الـله علـيه وسـلم- دەفەرموێت: (كَانَ عَلَى الطَّرِيقِ غُصْـنُ شَـجَرَةٍ يُـؤْذِي النَّـاسَ فَأَمَاطَهَـا رَجُـلٌ فَأُدْخِـلَ الْجَنَّـةَ) واتە: (لەسـەر ڕێگاوبانێـک لـقە دارێـک هەبـوو ئـازاری خەڵکـی دەدات، پیاوێک ئەم لقە دارەی لابرد؛ بەهۆی ئەم کردەوەیەوە چووە نێو بەهەشتەوە)، لابردنـی لقە دارێک هۆکاری چوونە بەهەشتە؛ ئەی چی سەبارەت بەو ئەو کەسـەی هۆکـاری هیدایەتدانی خەڵکیە وناخۆش وئازارەکانیان لەسـەر لادەبـات. وبە پێچەوانەوەشـەوە دانانی لقە دارێک بۆ ئازاردانی خەڵکی لەوەیە هۆکاری چوونە دۆزەخ بێـت؛ چ جـای ئەو کەسەی خەریکی بڵاوکردنەوەی کـوفر وتـاوانە بـۆ ئەوەی خەڵکـی بەرەو دۆزەخ ببات. [أخرجه البخـاري: (٦٥٢)، ومسـلم: (١٩١٤)، وابـن ماجـه: (٣٦٨٢)، وأحمـد: (١٠٤٣٢)]

**٣٧. یەکێک لە ئامانجەکانی شەریعەتی ئیسلام بریتیە لە پاراستنی ئەقڵ وحەرامکردن وقەدەغەکردنی هەرشتێک ببێتە هۆی تێکچوون ونەمانی ئەقڵ وهۆش وەکو مەی خواردنەوەی (خواردنەوەی سەرخۆشکەرەکان)، ئیسلام ئاینی وەکو ڕۆشنکەرەوەی ڕێبازی ئەقڵ ناساندووە؛ بۆ ئەوەی مرۆڤ خودا بپەرستێت بە چاوڕۆشنی وزانستەوە، وشەریعەتی ئیسلام باسی ئەقڵ وهۆشی بە مەزن داناوە وهەبوونی ئەقڵ وهۆشی بە مەرج داناوە بۆ واجب بوونی ئەرکە شەرعییەکان (تەکلیفە شەرعییەکان)، وئەقڵی ئازاد کرد لە کۆت وزنجیری خوڕافیات وبت پەرستی، لە ئاینی ئیسلامدا هیچ نهێنی وحوکمێک نییە کە تایبەت بێت بە چینێکی دیاریکراو جیا لە چینەکانی تر، وهەموو حوکم وشەریعەت ویاساکانی ئاینی ئیسلام ئەقڵی سەلامەت وتەندروست قبوڵی دەکات ودانی پێدا دەنێت، چونکە ئەم حوکمانە ئەوپەڕی دادپەروەری وحیکمەتی تێدایە.**

ئاینی ئیسلام هاتووە بۆ پاراستنی ئەقڵ وپرسی ئەقڵ وبیرکردنەوە وتێگەیشتنی بەرز وبڵند کردەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: {إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَٰئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا} واتە: {بەڕاستی گوێ وچاو ودڵ هەموو ئەوانە (خاوەنەکانیان) بەرپرسیارن لێیان} [الإسراء:٣٦]. بۆیە واجبە لەسەر مرۆڤ کە ئەقڵی بپارێزێت بۆیە ئاینی ئیسلام سەرخۆشکەرەکانی حەرامکردووە کە (مەی وماددە هۆشبەرەکان وهەرشتێک دەگرێتەوە کە ببێتە هۆی لەدەستدانی بیر وهۆش)، وحەرامکردنی سەرخۆشکەرەکان لە بڕگەی ژمارە (٣٤)دا باسکرا وزۆر لە ئایەتەکانی

قورئانی پیرۆز بەم ڕستانە کۆتایی هـاتووە: {لَعَلَّكُـمْ تَعْقِلُـونَ} واتە: {بەڵکـو ژیریتـان بخەنە کار وبیربکەنەوە} [البقرة:٢٤٢]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ۖ وَلَلدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ} واتە: {وە ژیـانی دونیـا هیچ نییە بێجگە گاڵتە و سـەرقاڵیی نەبێـت وە بێگومـان مـاڵی دوا ڕۆژ چـاکترە بـۆ ئەوانەی خۆیان دەپارێزن و لە خوا دەترسـن دەی ئایـا بـۆ ژیـر نـابن} [الأنعـام:٣٢]. وخوای گەورە دەفەرموێت: { إِنَّا أَنزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُـمْ تَعْقِلُـونَ } واتە: {بەڕاسـتی ئـێمە ناردومـانەتە خـوارەوە قورئانێـک بە -زمـانی- عەرەبـی بـۆ ئەوەی ژیـربن ولێـی تێبگەن} [یوسف:٢]. وخـوای گەورە ڕوونـی کـردووەتەوە کە هیـدایەت وحـیکمەت تەنها ئەوانەی ئاقڵ وژیرن سوودی لێدەبینن وتەنها ئەوانەن زیرەک وهۆشـمەندەکان، خوای گەورە دەفەرموێت: {يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَن يَشَاءُ ۚ وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ } واتە: {دەیبەخشێت ژیری ودانایی بە هەرکەسـێک کە بیەوێت و هەرکەسێک ژیری ودانایی پێدرابێت ئەوا بەڕاستی خێـر وچـاکەیەکی زۆری پێدراوە، زۆرینە پەند وەرناگرن تەنها خـاوەن ژیـری وهۆشـمەندەکان نەبێـت} [البقرة:٢٦٩].

بۆیە ئاینی ئیسلام بوونی ئەقڵـی بە مەرج دانـاوە بـۆ واجـب بـوونی ئەرکە شەرعییەکان -تەکلیفە شەرعییەکان-، پێغەمبەری خـودا -صـلی الـله علـیە وسـلم- دەفەرموێت: «رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثٍ: عَنِ النَّـائِمِ حَتَّـى يَسْـتَيْقِظَ وَعَـنِ الصَّـبِيِّ حَتَّـى يَحْتَلِمَ وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ» واتە: «پێنووسی تاوان نوسین لەسەر سـێ کـۆمەڵ هەڵگیراوە : کەسی خەوتـوو هەتـا بەخەبەر دەبێـتەوە، ومنـداڵ هەتـا بـاڵغ دەبێـت، وکەسی شێت هەتا چاک دەبێتەوە (ئاقڵ دەبێتەوە)». [أخرجه البخاري:(٥٢٦٩)، وأبو داود: (٤٤٠٢)، والترمـذي: (١٤٢٣)، والنسـائي في السـنن الكـبرى: (٧٣٤٦)، وأحمـد: (٩٥٦)، وابـن ماجـه: (٢٠٤٢)]. وئـازادی کـرد لە کـۆت وزنجیـری خوڕافیـات وبـت

پەرستی، وسەبارەت بە حاڵی ئومەتانی پێشوو کە دەستیانگرت بە خوڕافیات وڕەتدانەوەی ئەو هەقەی لایەن خوداوە هاتبوو، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَكَذَٰلِكَ مَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَىٰ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰ آثَارِهِم مُّقْتَدُونَ} واتە: {هەروەها پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە لە هیچ شارێکدا مەگەر خۆشگوزەرانەکان (دەوڵەمەندەکان)ی ووتویانە بەڕاستی ئێمە باوو باپیرانی خۆمان لەسەر ئاینێك بینیووە وە بەڕاستی ئێمە لەسەر ئاینی ئەوان دەڕۆین} [الزخرف:٢٣]. خوای گەورە سەبارەت بە گفتوگۆی ئیبراهیم -علیە السلام- لەگەڵ قەومەکەی لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: کە ئیبراهیم -علیه السلام- فەرموویەتی: {مَا هَٰذِهِ التَّمَاثِيلُ الَّتِي أَنتُمْ لَهَا عَاكِفُونَ (٥٢) ئا ئەم پەیکەر و بتانە چین؟ کە ئێوە دەیان پەرستن (بە لایانەوە ماونەتەوە)؟ (٥٢) قَالُوا وَجَدْنَا آبَاءَنَا لَهَا عَابِدِينَ (٥٣) -قەومەکەی- ووتیان: باوباپیرانمان بینیووە ئەمانەیان پەرستووە (٥٣)} [الأنبياء:٥٢-٥٣]. وئاینی ئیسلام هات وفەرمانی بە خەڵکی کرد کە واز بە بت پەرستی بهێنن ودەست هەڵبگرن لەو شتە خوڕافیاتانەی کە لە باوباپیرانەوە ماوەتەوە، وفەرمانی بەوە کرد کە دەبێت مرۆڤ شوێنی ڕێبازی پێغەمبەران بکەوێت -علیهم الصلاة والسلام-.

وله ئاینی ئیسلامدا هیچ نهێنی وحوکمێک نییە کە تایبەت بێت بە چینێک لە خەڵکی جیا لە چینەکانی تر، عەلی کوڕی ئەبی تالیب -ڕەزای خوای لێبێت- کە کوڕی مامی پێغەمبەرە -صلی الله علیه وسلم-ومێردی فاتیمەی کچێتی پرسیاری لێکرا: ئایا پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم- شتێکی تایبەتی بە ئێوە وتووە (پیشانداوە) کە بە خەڵکی نەوتبێت (پیشان نەدابێت)؟ ئەویش (عەلی) ووتی: «هیچ شتێکی بە تایبەت بۆ ئێمە نەوتووە (پیشان نەداوە) کە بە خەڵکی تری نەووتبێت مەگەر ئەوە نەبێت کە لە کێلانی شمشێرەکەمدایە»، گێڕەرەوەکە دەڵێت: «پەڕەیەکی دەرهێنا کە تێیدا نووسرابوو: «نەفرەتی خودا لەو کەسەی ئاژەڵ

سەردەبڕێت (قوربانی دەکات) لە پێناو کەس وشتێک جگە لە خودا، ونەفرەتی خـودا لەو کەسەی نیشانەکانی زەوی دەگۆڕێت (بـۆ ئەوەی خـاکی کەسـێکی تـر بـۆ خـۆی ببات)، ونەفرەتی خودا لەو کەسەی نەفرەت لە دایک وباوکی دەکات، ونەفرەتی خودا لەو کەسەی کە پشتیوانی بیدعەچییەک دەکات» [صـحیح مسـلم: ١٩٧٨]. وهەمـوو حوکم ویاسا وشەریعەتەکانی ئاینی ئیسلام ئەقڵی دروست وسەلامەت پێی ڕازیە وبە لایەوە پەسەندە، وئەم حوکمانە لە ئەوپەڕی دانایی وحیکمەت ودادپەروەریدان.

## ٣٨. ئەگەر شـــوێنکەوتووانی ئـــاینە پوچەڵەکـــان درک نەکەن بەو دژیەکی وشتانەی کە لە ئاینە پوچەڵەکەدا هەیە کە ئەقڵی سەلامەت ڕەتی دەکـاتەوە ئەوا پیـاوانی ئـاینەکە شـوێنکەوتووان بەوە هەڵـدەخەڵەتێنن کە ئاین لە سەرەوەی ئەقڵە وئەقڵ بۆی نییە لە ئاین تێبگات ودرکی پێبکـات، بەڵام ئیسلام ئاینی وەکو ڕێگایەکی ڕۆشنا بـۆ ئەقـڵ دانـاوە کە بەهـۆیەوە ئەقڵ ڕێگا ومەبەسـتی خـۆی دەزانێـت لەم ژیـانەدا، وئـاینە پوچەڵەکـان دەیانەوێت مرۆڤ واز لە ئەقڵ بهێنێت وشوێنیان بکەوێت، وئاینی ئیسـلام دەیەوێت مرۆڤ هۆشی بێتەوە وئەقڵی بەکاربهێنێت بـۆ ئەوەی هەقـیقەت وڕاستیەکانی بۆ دەربکەوێت بەو شێوەیەی کە هەیە.

ئەگەر شوێنکەوتووانی ئاینە پوچەڵەکان درک نەکەن بەو دژیەکی وشتانەی کە لە ئـاینە پـوچەڵەکەدا هەیە کە ئەقڵـی سـەلامەت ڕەتـی دەکـاتەوە ئەوا پیـاوانی ئاینەکە شوێنکەوتووان بەوە هەڵدەخەڵەتێنن کە ئاین لە سەرەوەی ئەقڵە وئەقڵ بـۆی نییە لە ئاین تێبگات ودرکی پێبکات، بەڵام ئیسلام ئاینی وەکو ڕێگایەکی ڕۆشـنا بـۆ ئەقڵ داناوە کە بەهۆیەوە ئەقڵ ڕێگا ومەبەستی خـۆی دەزانێـت لەم ژیـانەدا، وئـاینە

پوچەڵەکان دەیانەوێت مرۆڤ واز لە ئەقڵ بهێنێت وشوێنیان بکەوێت، وئاینی ئیسلام دەیەوێت مرۆڤ هۆشی بێتەوە وئەقڵی بەکاربهێنێت بۆ ئەوەی هەقیقەت وڕاستیەکانی بۆ دەربکەوێت بەو شێوەیەی کە هەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَٰكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَن نَّشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ} واته: {هەر بەو شێوەیەی کە ووتمان قورئانمان بۆ تۆ نارد (ئەی موحەممەد -صلى الله عليه وسلم-) بە فەرمانی خۆمان کە تۆ نەتدەزانی کتێب وئیمان چییە بەڵام ئێمە ئەوەمان کردە ڕووناکیەك ڕێنمونی هەر کەسێکی پێ دەکەین کە بمانەوێت لە بەندەکانمان وە بەڕاستی تۆ (خەڵك) ڕێنمونی دەکەیت بۆ ڕێگای ڕاست} [الشورى:٥٢]. وەحی خودا بەڵگە ونیشانەی زۆری تێدایە کە ڕێنموێنی ئەقڵە سەلامەتەکان دەکات بۆ هەندێک هەقیقەت وڕاستی کە ئەقڵ حەز دەکات بیزانێت وباوەڕی پێ بهێنێت، خوای گەورە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَكُم بُرْهَانٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا} واته: {ئەی خەڵکینە بەڕاستی بۆتان هات بەڵگەی ئاشکرا لەپەروەردگارتانەوە، وناردمانە خوارەوە بۆتان نور وڕووناکیەکی ئاشکرا (کە قورئانە)} [النساء:١٧٤]. خوای گەورە -سبحانه وتعالى- دەیەوێت مرۆڤ لە نور وڕۆشنایی هیدایەت وزانست وهەقیقەتدا بژێت، بەڵام شەیتانەکان وتاغوتەکان دەیانەوێت مرۆڤ لە تاریکایی کوفر ونەفامی وگومڕایی بژێت، خوای گەورە دەفەرموێت: {اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ ۖ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ} واته: {خوا دۆست وپشتیوانی ئەوانەیە کە بڕوادارن دەریان دەهێنێت لە تاریکستانی بێباوەڕی وکوفرەوە بەرەو باوەڕ (ئیمان) وڕێنمونی وئەوانەی کە بێباوەڕن (کافرن) شەیتان دۆستیانە دەریان دەهێنێت لە ڕووناکی بیروباوەڕ (ئیمان) بەرەو تاریکستانی کوفر وگومڕایی} [البقرة:٢٥٧].

## ٣٩. ئاینی ئیسلام زانستی ڕاست ودروست به مەزن دادەنێت وهانی گەڕانی زانستی دەدات کە دوور بێت لە هەوا وئارەزوو، وبانگەشە دەکات بۆ تێڕوانین وبیرکردنەوە لە دەروون ولاشەی مرۆڤ وگەردوون وبوونەوەرەکان وئەو شتانەی لە دەوروپشتمان، ودەرەنجامە ڕاست ودروستەکانی زانست تووشی هیچ پێکدادانێک نابن لەگەڵ ئاینی ئیسلامدا.

ئاینی ئیسلام زانست وعیلمی ڕاست ودروست بە مەزن دادەنێت، خوای گەورە دەفەرموێت: {يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ} واتە: {خودا پلە وپایەی ئەو کەسانە بەرز دەکاتەوە لە ئێوە کە بڕوایان هێناوە وە ئەوانەی کە زانستیان پێ بەخشراوە بە چەند پلەیەک (پلەیان بەرز دەکاتەوە) وە خوا شارەزایە بەوەی دەیکەن} [المجادلة:١١]. وخوای گەورە شاهێدی دانی زانایانی لەگەڵ شاهێدی دانی خۆی وفریشتەکان باسکردووە سەبارەت بە شاهێدی دان لەسەر مەزنترین بابەت، خوای گەورە دەفەرموێت: {شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ } واتە: {خودا شاهێدی دەدات (واتە ڕایدەگەیەنێت وبە بەڵگە دەیچەسپێنێت) کە بەڕاستی هیچ پەرستراوێکی بە هەق وڕاست نییە کە شایەنی پەرستن بێت جگە لە ئەو زاتە مەزنە نەبێت وفریشتەکانیش شاهێدی دەدەن (واتە: دانیپێدا دەنێن) وخاوەن زانستەکان (زانایان)یش شاهێدی دەدەن (واتە: باوەڕی چەسپاویان هەیە)، خودا هەمیشە دادپەروەری ڕاگرتووە؛ هیچ پەرستراوێکی هەق وڕاست نییە کە شایەنی پەرستن بێت جگە لە ئەو وخودا شکۆدار ودانایە} [آل عمران:١٨]. وئەمیش پێگەی زانایان ڕووندەکاتەوە لە ئاینی ئیسلامدا وخودا فەرمانی بە پێغەمبەر -صلى الله عليه

وســـلم- کە داوای زیـــادکردنی زانســـتی بکـــات لە خـــوای گەورە، خـــوای گەورە دەفەرموێت: {وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا} واتە: {وە بڵێ ئەی پەروەردگارم زانست و زانیـاریم زیاد بکە} [طه:١١٤]. وپێغەمبەری خودا -صلی اللّٰه علیه وسلم- دەفەرموێـت: «مَـنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا سَهَّلَ اللَّهُ لَـهُ طَرِيقًـا إِلَى الْجَنَّـةِ وَإِنَّ الْمَلَائِكَـةَ لَتَضَـعُ أَجْنِحَتَهَا رِضًا لِطَالِبِ الْعِلْمِ وَإِنَّ طَالِبَ الْعِلْمِ يَسْتَغْفِرُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ حَتَّـى الْحِيتَانِ فِي الْمَاءِ وَإِنَّ فَضْلَ الْعَالِمِ عَلَى الْعَابِدِ كَفَضْلِ الْقَمَرِ عَـلَى سَـائِرِ الْكَوَاكِـبِ إِنَّ الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الْأَنْبِيَاءِ إِنَّ الْأَنْبِيَاءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِينَارًا وَلَا دِرْهَمًا إِنَّمَا وَرَّثُوا الْعِلْمَ فَمَنْ أَخَـذَهُ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ» واتە: «هەرکەسێک ڕێگـایەک بگـرێتە بەر بـۆ فێربـوون وگەڕان بە دوای زانستی شەرعیدا ئەوا خوای گەورە ڕێگای چوونە بەهەشتی بۆ ئاسان دەکـات، وفریشتەکان باڵیان ڕادەخەن بۆ فێرخوازی زانسـتی شـەرعی، وفێرخـوازی زانسـتی شـەرعی هەمـوو ئەوانەی لە ئاسـمانەکان وزەویـدا داوای لێخۆشـبوونی بـۆ دەکەن تەنانەت ماسییەکانی نێو دەریـاش، وفەزڵـی زانـا بەسـەر ئەو کەسـەی زۆر پەرسـتن ئەنجامدەدات (بە باشی شارەزای زانستی شەرعی نییە : عابیدە) وەکو فەزڵی مـانگە بەسەر هەموو ئەستێرەکانەوە، وزانایان میراتگری پێغەمبەرانن، وپێغەمـبەران دینـار ودرهەمیان لە دوای خۆیان بە جێنەهێشتووە بەڵکو زانسـتیان بەجێهێشـتووە، بـۆیە هەرکەسـێک هەوڵـی بەدەسـتهێنانی بـدات ئەوا بەشـێکی باشـی بەدەسـتهێناوە (بـۆ لەبەرکـردن وکـردەوە پێکـردن وفێرکـردن)» [أخرجـه أبـو داود: (٣٦٤١)، والترمـذي: (٢٦٨٢)، وابن ماجه: (٢٢٣) واللفظ له، وأحمد: (٢١٧١٥)].

ئاینی ئیسلام هانی گەڕانی زانستی دەدات کە دوور بێت لە هەوا وئـارەزوو، وبانگەشە دەکات بـۆ تێـڕوانین وبیرکـردنەوە لە دەروون ولاشـەی مـرۆڤ وگەردوون وبوونەوەرەکان وئەو شتانەی لە دەوروپشتمان، خـوای گەورە دەفەرموێـت: {سَـنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّـهُ عَـلَىٰ كُـلِّ

شَيْءٍ شَهِيدٌ} واته: {لەمەودوا بەڵگە کانی خۆمانیان نیشان دەدەین لە ئاسۆی دونیا (لە بوونەوەردا) ولە خودی خۆیاندا هەتا بۆیان ڕوون بێتەوە بێگومان ئەم (قورئانە) ڕاستە ئایا پەروەردگارت بەس نییە کە بەڕاستی ئاگادارە بە سەر هەموو شتێکدا} [فصلت:٥٣]. وخوای گەورە دەفەرموێت: { أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ وَأَنْ عَسَىٰ أَن يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ} واته: {ئایا ئەوانە ناڕوانن؟ لەو موڵکە گەورە وفراوانەی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە ولەو شتانەی خوای گەورە دروستی کردوون ولەوانەیە نزیک بوو بێتەوە کۆتایی (ژیان) یان ئینجا بە چی قسەیەک لە پاش قورئان بڕوا دەهێنن} [الأعراف:١٨٥]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ} واته:{ئایا ئەوان بەسەر زەویدا نەگەڕاون بۆ ئەوەی ببینن سەرەنجامی ئەو (گەلانەی بێباوەڕ بوون) لە پێش ئەمان چۆن بووە کە زۆر بەهێزتر بوون لە ئەمان (لە خەڵکی مەککە) و زەویان کێڵا (بۆ کشتوکاڵ) و ئاوەدانیان کردەوە زیاتر لەمان وپێغەمبەرانیان بۆ هات بە موعجیزە ڕوونەکانەوە بۆیە خوا ستەمی لێ نەکردوون (کە لەناوی بردوون) بەڵام خۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد} [الروم:٩]. وئەنجامە زانستیە ڕاستەکان تووشی پێکدادان نابێت لەگەڵ ئاینی ئیسلامدا ولێرەدا باسی یەک نمونە دەکەین کە لە قورئانی پیرۆزدا وردەکاریە بچووکەکانیشی باسکراوە پێش زیاتر لە هەزار وچوار سەد ساڵ کەچی زانست لە سەدەی ڕابردوودا وردەکارییەکانی ئەم بابەتەی دۆزییەوە؛ بۆیە ئەنجامەکانی زانست وەکو ئەوەیە کە لە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە وئەم بابەتەش بریتیە لە چۆنیەتی دروستبوونی کۆرپەلە لە سکی دایکیدا، خوای گەورە دەفەرموێت: { وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ (١٢) سوێند

بەخوا بەڕاستی مرۆڤمان دروستکرد لە خۆلاسە و پاڵفتەیە لە قوڕ (١٢) ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ (١٣) لەپاشان ئەومان کرد بە نوتفەیەک -دڵۆپە مەنیەک- لە ئارامگایەکی پتەو (منداڵدانی دایک)دا (١٣) ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ (١٤) دواتر نوتفەکەمان -دڵۆپە مەنیەکانمان- کرد بە خوێنی مەیو ئەمجا خوێنە مەیوەکەشمان کرد بە پارچە گۆشتێک و ئەمجا پارچە گۆشتەکەمان کرد بە ئێسقان ئەمجا بە گۆشت (پەیکەرە) ئێسکەکەمان داپۆشی پاشان ئەومان کرد بە دروستکراوێکی تر جا گەورە وپیرۆزە ئەو خوایەی کە چاکترینی بەدیهێنەرانە (١٤)} [المؤمنون:١٢-١٤].

٤٠. وخوای گەورە تەنها کردەوەکان (پەرستنەکان) لە ئەو کەسانە قبوڵ دەکات کە باوەڕیان بە خودا هێناوە وملکەچی فەرمانەکانی بوون وباوەڕیان بە پێغەمبەران هێناوە -علیهم السلام- وخوای گەورە تەنها ئەو کردەوانە (پەرستنانە) قبوڵ دەکات کە لە شەریعەتدا فەرمانی لەسەر داوە، بۆیە چۆن مرۆڤ کوفر وبێباوەڕ دەبێت بە خوای گەورە وهیوای ئەوەیە کە پاداشتی بداتەوە؟ وخوای گەورە ئیمان وباوەڕی هیچ کەسێک قبوڵ ناکات ئەگەر باوەڕی بە هەموو پێغەمبەران نەبێت -علیهم السلام- ودەبێت باوەڕی بە کۆتا پێغەمبەریش بێت کە موحەممەدە -صلى الله عليه وسلم-.

وخوای گەورە تەنها کردەوەکان (پەرستنەکان) لە ئەو کەسانە قبوڵ دەکات کە باوەڕیان بە خودا هێناوە وملکەچی فەرمانەکانی بوون وباوەڕیان بە پێغەمبەران هێناوە -علیهم السلام-، خوای گەورە دەفەرموێت: {مَّن كَانَ يُرِيدُ الْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُ

فِيهَا مَا نَشَاءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُ جَهَنَّمَ يَصْلَاهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا (١٨) هەرکەسێک تەنها ژیانی دونیای بوێت (لەم دونیایەدا) زوو پێی دەدەین ئەوەی بمانەوێت بۆ هەرکەسێک لە پاشان دۆزەخمان بۆ سازداوە دەچێتە ناوی بە لۆمەکراوی ودەرکراوی لە میهرەبانی خودا (١٨) وَمَنْ أَرَادَ الْآخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَٰئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا (١٩) هەرکەسێکیش مەبەستی ڕۆژی دوایی بوویێت وە هەوڵی بۆ بدات بەو جۆرەی شایستەیە و باوەڕداریش بێت ئا ئەوانە کردەوە و تێکۆشانەکەیان وەرگیراوە (لای پەروەردگاریان) (١٩)} [الإسراء:١٨-١٩]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {فَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا كُفْرَانَ لِسَعْيِهِ وَإِنَّا لَهُ كَاتِبُونَ} واتە: {ئینجا هەر کەس (هەرچەند) لە کردەوە چاکەکان بکات (بەو مەرجەی) باوەڕداریش بێت ئەوا (پاداشتی) کۆششەکەی وون نابێت و بەفیڕۆ ناڕوات بەڕاستی ئێمە بۆ (کردەوەکانی) ئەو نووسەرین} [الأنبياء:٩٤]. وخودا تەنها ئەو پەرستنانە قبوڵ دەکات کە لە شەریعەتەکەیدا بڕیاری لەسەر داوە، خوای گەورە دەفەرموێت: {فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا} واتە: {ئینجا هەرکەسێک بەتەمایە بگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگاری (لە قیامەتدا) ئەوا با کردەوەی چاک بکات وکەس نەکاتە هاوبەش وشەریکی پەروەردگار لە پەرستنیدا} [الكهف:١١٠]. خوای گەورە ڕوونی کردووەتەوە کە کردەوە بە چاک دانانرێت ئەگەر لەو کردەوانە نەبێت کە بە ئیمان وباوەڕ بە خودا وبە دڵسۆزی بۆ خودا ئەنجامدراوە ولە شەریعەتی خودا بڕیاری لەسەر دراوە وکەسەکە باوەڕی بە هەموو پێغەمبەران هەبووە؛ بەڵام ئەگەر کردەوەکە یەکێک لەم مەرجانەی تێدا نەبێت ئەوا ڕەت دەکرێتەوە وقبوڵ ناکرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَقَدِمْنَا إِلَىٰ مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَّنثُورًا} واتە: {هاتین هەر کردەوەیەکیان کرد بوو هەموویمان وەکو تۆزی پرش وبڵاو لێکرد} [الفرقان:٢٣]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ

خَاشِعَةٌ (٢) زۆر دەموچاو -ڕوو- لەو ڕۆژەدا ترسناك وڕیسوا وشەرمەزارن (٢) عَامِلَـةٌ نَّاصِبَةٌ (٣) هەوڵدەرێکی ڕەنجەڕۆن (٣) تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَـةً (٤) دەچـنە نێـو ئـاگرێکی زۆر گەرمەوە (٣)} [الغاشية:٢-٤].

ئەم ڕووانە لەو ڕۆژەدا خەجـاڵەت وشــەرمەزارن ومانــدوون بەهــۆی زۆر کردەوە کردنەوە بەڵام کردەوەکانیان بە پێی پەیامی خودا نەبووە؛ چونکە کردەوەکانیان بە پێی ئەو شەریعەتە نەبوو کە خودا دایبەزاند، بەڵکو خودایان پەرست بە هەندێک کردەوەی هەڵە وشوێنکەوتووی سەرانی گومڕایی بوون ئەوانەی کە ئـاینی پوچەڵیـان بۆیان دادەنا، ئەو کردەوە چاکەی کە لە لای خـوای گەورە قبـوڵ دەکرێـت ئەوەیە کە دەبێت بە دڵسۆزی بۆ خودا بێت وبە گـوێرەی سـونەتی پێغەمـبەر -صـلى الـله علـيه وسلم- بێت، ئیتر چۆن مرۆڤ کافر وبێباوەڕ دەبێت بە خودا وهیوای ئەوەیە کە خـودا پاداشتی بداتەوە؟؟ وخوای گەورە ئیمان وباوەڕهێنـانی هـیچ کەسـێک قبـوڵ ناکـات مەگەر پاش ئەوە نەبێت کە باوەڕ دەهێنێـت بە هەمـوو پێغەمـبەران -علـيهم الصـلاة والسلام- وئیمان دەهێنێت بە پەیامی موحەمەد -صـلى الـله علـيه وسـلم-، وپێشـتر باسی هەندێک بەڵگەمان کرد سەبارەت بە ئەم بابەتە لە بـڕگەی ژمـارە (٢٠)، خـوای گەورە دەفەرموێت: {آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّـهِ وَالْمُؤْمِنُـونَ كُـلٌّ آمَـنَ بِـاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُوا سَـمِعْنَا وَأَطَعْنَـا غُفْرَانَـكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ} واتە: {پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- بڕوای هێنا بەو پەیامەی کە بۆی نێردراوە لە پەروەردگاریەوە لەگەڵ بڕواداراندا هەموو بڕوایان هێنـاوە بە خـوا وبە فریشتەکانی وبە کتێبەکانی (پەیامەکانی) وبە پێغەمبەرانی جیـاوازی نـاکەین لە نێوان هـیچ یەکێـک لە پەیـامبەران (بـڕواداران) ووتیـان: (پێغەمـبەر ئـاینی خـوای پێگەیاندین ئێمەش) بیستمان فەرمانبەرداریمان کرد داوای لێخۆشبوونت لێـدەکەین ئەی پەروەردگارمان وهەر بۆ لای تۆیە گەڕانەوەمـان} [البقـرة:٢٨٥]. وخـوای گەورە

دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنزَلَ مِن قَبْلُ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا} واته:{ئەی کەسانێک کە باوەڕتان هێناوە بەردەوام بن لەسەر باوەڕ بەخوا و پێغەمبەرەکەی و بەو قورئانەی ناردوویەتیە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەی و بەو کتێبانەش کە پێشتر ناردوویەتیە خوارەوە, و هەر کەسێک بێ باوەڕ بێت بە خوا و بە فریشتەکانی و بە کتێبەکانی و بە پێغەمبەرەکانی و بە ڕۆژی دوایی ئەوا بەڕاستی گومڕا بووە بە گومڕاییەکی زۆر دوور (لەڕاستی)} [النساء:١٣٦]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُم مِّن كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنصُرُنَّهُ ۚ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِي ۖ قَالُوا أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ} واته: {(بیهێنەوە یادیان) کاتێک کە خوا پەیمانی وەرگرت لە پێغەمبەران کە هەرچیم پێدان لە پەیام و حیکمەت و (شەریعەت) لە پاشان پێغەمبەرێکتان بۆ هات بە بڕواهێنەر بەو پەیامەی کە لە لاتانە دەبێت بڕوای پێ بهێنن وە یارمەتی بدەن، خوا فەرمووی: ئایا دانتان نا بەم پەیمانەدا؟ وە لەسەر ئەوە پەیمانی منتان وەرگرت پێغەمبەران ووتیان: بەڵێ دانمان پێدانا و پەیمانمان بەست خوا فەرمووی: کەواتە ئێوە بەشاهێد بن وە منیش لەگەڵ ئێوە یەکێکم لە شاهێدان} [آل عمران : ٨١].

**٤١. ئامانجی هەموو پەیامەکانی خودا بریتیە لەوەی: کە ئاینی هەقی خودا مرۆڤ بەرز وبڵند وباڵا بکات کە مرۆڤ تەنها بەندەیەکی دڵسۆزی پەروەردگاری هەموو بوونەوەرەکان بێت وئەم ئاینە مرۆڤ ڕزگار دەکات لە کۆیلایەتی وبەندایەتی کردن بۆ مرۆڤەکان وبۆ ماددە وبۆ خوڕافەت، ئاینی ئیسلام -هەروەکو دەیبینین- بانگەشەی ئەوە ناکات کە مرۆڤەکان بێگەردن ودوورن لە کەموکورتی ولە ئەوپەڕی کامڵیدان ومرۆڤەکان بەرز ناکاتەوە بۆ سەرەوەی پلەوپایەی خۆیان بەشێوەیەک کە پەرستراو وپەروەردگار وخودا.**

ئامانجی هەموو پەیامەکانی خودا بریتیە لەوەی: کە ئاینی هەقی خودا مرۆڤ بەرز وبڵند وباڵا بکات کە مرۆڤ تەنها بەندەیەکی دڵسۆزی پەروەردگاری هەموو بوونەوەرەکان بێت وئەم ئاینە مرۆڤ ڕزگار دەکات لە کۆیلایەتی وبەندایەتی کردن بۆ مرۆڤەکان وبۆ ماددە وبۆ خوڕافەت، پێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ وَالقَطِيفَةِ وَالخَمِيصَةِ إِنْ أُعْطِيَ رَضِيَ وَإِنْ لَمْ يُعْطَ لَمْ يَرْضَ» واتە: «سەرشۆڕ بێت بەندەی دینار، سەرشۆڕ بێت بەندەی درهەم، سەرشۆڕ بێت بەندەی جلوبەرگ، ئەگەر پێی ببەخشرێت ڕازی دەبێت؛ ئەگەر پێی نەبەخشرێت توڕە دەبێت». [صحيح البخاري: ٦٤٣٥]. مرۆڤی ژێر تەنها ملکەچی فەرمانەکانی خودا دەبێت، بۆیە سامان ومال و پلەوپایە وعەشیرەت نایکەنە کۆیلە وئەوەی لەم باسەدا هاتووە بۆ خوێنەر ڕوونی دەکاتەوە کە حاڵی خەڵکی چۆن بوو پێش هاتنی پەیام ئیسلام ولە پاش هاتنی ئەم پەیامە پیرۆزە چۆن حاڵیان گۆڕا !!؟؟ کاتێک هەندێک لە مسوڵمانان کۆچیان کرد بەرەو حەبەشە وپادشای حەبەشە لەو کاتەدا -نەجاشی- پرسیاری لێکردن، وپێیانی ووت: ئەم ئاینە

چیــیە کە بەهــۆیە ناکۆکیتــان دروســتکرد بەرامــبەر قەومەکەتــان، ونەهــاتنە نێــو ئاینەکەی من ونەهاتنە نێو ئاینی هــیچ یەکێــک لە ئومەتەکــان؟ جەعــفەری کــوڕی ئەبی تاڵب -ڕەزای خوای لێبێت- پێــی ووت: ئەی پادشــا، ئــێمە قەومێــک بــووین لە جاهیلیەتــدا -لە پــێش ئیســلامدا- بــتمان دەپەرســت وگۆشــتی مردوومــان دەخــوارد وتاوانی قێزەوەنمــان دەکــرد وپەیوەنــدی خزمــایەتیمان دەپچڕانــد وخراپەکــار بــووین بەرامبەر دراوسێ وکەسی بەهێز زاڵ بوو بەسەر کەســی لاوازدا، بەو شــێوەیە بــووین هەتــاوەکو خــوای گەورە پێغەمبەرێکــی لە خۆمــان بــۆ نــاردین کە زانیــاریمان هەیە سەبارەت بە ڕەچەڵەک وڕاستگۆیی وئەمانەت وداوێن پاکی، وبانگی کردین بۆ تەنهــا بە تاکدانانی (تەوحیدی) خودا و پەرستنی، وبۆ وازهێنــان لە پەرســتنی ئەو شــتانەی کە خۆمــان و باوباپیرانمــان دەمانپەرســت لە بەرد وبتەکــان، وفەرمــانی پێکــردین بە ڕاستگۆیی وپاراستنی ئەمانەت وگەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی وچــاکبوون بەرامــبەر دراوســێ، وئەنجــام نەدانی حەرامکراوەکــان، وئەنجــام نەدان ودوور کەوتــنەوە لەم تاوانانەش: کوشتن وخوێن ڕشتن (بە ناهەق)، وشاهێدی دانی درۆ، وخواردنی مــاڵی هەتیو، وبوهتان هەڵواسین بۆ ئیمانداری داوێــن پــاک، وفەرمــانی پێکــردین بە تەنهــا پەرســتنی خــودا بە بــێ ئەوەی هــیچ هــاوبەش وشــەریکێکی بــۆ بڕیــار بــدەین لە پەرســتنیدا، وفەرمــانی پێکــردین بە ئەنجامــدانی نــوێژ وزەکاتــدان وڕۆژوو گــرتن، ودەڵێت: زۆر شتی تری ئیسلامی باسکرد، بۆیە ئێمە بەڕاستمان دانا وباوەڕمــان پێــی هێنا وشوێنی کەوتین بەو شێوەیەی ئەو پەیامەکەی هێنــاوە بــۆیە ئــێمە تەنهــا خــودا دەپەرســتین وهــیچ هاوبەشــێکی بــۆ بڕیــار نــادەین، وهەمــوو ئەوانەی حەرامکــرا لەسەرمان ئێمە بە حەراممان دانا (ئەنجــامی نــادەین)، وهەمــوو ئەوانەی حەڵاڵکــرا بۆمان ئێمەش بە حەڵاڵمان دانا (دروســتە ئەنجــامی بــدەین)... [رواه أحمــد: ١٧٤٠، ورواه أبو نعيم في حلية الأولياء:١/١١٥].

ئاینی ئیسلام مرۆڤەکـان بەرز ناکـاتەوە بـۆ سـەرەوەی پلەوپـایەی خۆیـان وبەرزیان ناکاتەوە بۆ پلەی پەروەردگارێتی وخـودایەتی، خـوای گەورە دەفەرموێـت: {قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِـهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ فَإِن تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ} واتە: {(ئەی موحەممەد -صلى الله عليه وسلم-) پێیان بڵێ: ئەی خـاوەن پەیامەکـان وەرن بۆ لای وتەیەکی ڕاست و(یەکسان) لە نێوان ئێمە وئێوەدا کە جگە لە خوا هیچ نەپەرسـتین وهـیچ شـتێک نەکەیـن بە هاوبەشـی (لە پەرسـتنیدا) وهەنـدێکمان هەندێکمان بە پەروەردگار دانەنێین ئەمجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد ئێوەش بڵێن: ئێوە شاهێد بن کە ئێمە فەرمانبەردار وگـوێڕایەڵ وملکەچـی خـوداین} [آل عمـران:٦٤]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا الْمَلَائِكَةَ وَالنَّبِيِّينَ أَرْبَابًا أَيَـأْمُرُكُم بِـالْكُفْرِ بَعْـدَ إِذْ أَنـتُم مُّسْـلِمُونَ} واتە: { وخـودا فەرمانتـان پێنـادات کە فریشـتەکان وپێغەمبەران بکەن بە پەرستراوی خۆتان چۆن (خودا) فەرمانتان پێدەدات بێباوەڕ بن (کافر بن) دوای ئەوەی کە ئێوە بڕوادار بوون؟! } [آل عمران:٨٠]. وپێغەمبەری خودا -صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێت: «لاَ تُطْرُونِي كَمَا أَطْرَتْ النَّصَارَى ابْنَ مَرْيَمَ فَإِنَّمَـا أَنَا عَبْـدُهُ فَقُولُـوا عَبْـدُ اللَّهِ وَرَسُـولُهُ»واتە: «زیـادەڕەوی مەکەن لە وەسـفکردنی مـن هەروەکـو چـۆن نەسـڕانیەکان زیادەڕەوییـان کـرد لە وەسـفکردنی کـوڕی مەریەم (عیسا)، من تەنها بەندەم، بۆیە بڵێن: بەندەی خودا (عبد الله) وپێغەمـبەری خـودا» [صحيح البخاري: ٣٤٤٥].

**٤٢. خوای گەورە لە شـەریعەتەکەیدا ڕێـگەی داوە بە تەوبە کـردن: کە ئەمیش بریتیە لە گەڕانەوەی مرۆڤ بۆ لای پەروەردگار و وازهێنـان لە تاوان وگوناهەکان، ومسوڵمان بوون وپەیڕەو کردنی ئاینی ئیسـلام هۆکـارە بۆ لێخۆشبوون لە هەموو تاوان وگوناهەکانی پێشوو، وهەروەها تەوبە کردن هۆکارە بۆ لێخۆشبوون لە هەموو تاوان وگوناهەکانی پێشوو، بۆیە پێویسـت ناکات تاوان وگوناهەکـانی لای هـیچ یەکێـک لە مرۆڤەکـان بـاس بکـات ودانی پێدا بنێت لە لای ئەوان.**

وخوای گەورە تەوبە کردنی لە ئـاینی ئیسـلامدا دانـاوە وڕێـگەی پێـداوە، وتەوبە کردن بریتیە لە: گەڕانەوەی مـرۆڤ بـۆ لای پەروەردگـاری ئەمـیش بە تەوبە کردن و وازهێنان لە تاوان وگوناهەکـان، خـوای گەورە دەفەرموێـت: {وَتُوبُـوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ} واتە: {هەمووتان تەوبە بکەن و بگەڕێـنەوە بـۆ لای خوا ئەی ئیمانداڕەکان تا ڕزگار و سـەرکەوتوو بـن} [النـور:٣١]. وخـوای گەورە دەفەرموێت: {أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ وَيَأْخُـذُ الصَّـدَقَاتِ وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ } واتە:{ئایا نەیان زانیوە کە بێگومان هەر خوا تەوبە و پەشیمانی لە بەندەکانی وەردەگرێت و هەر ئەو خێر وبەخشـینەکان وەردەگرێـت و بەڕاسـتی هەر خـوایە وەرگـری تەوبەیە و میهرەبـانە (لەگەڵ بەندەکانیـدا)} [التوبـة:١٠٤]. وخـوای گەورە دەفەرموێت: {وَهُوَ الَّذِي يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ وَيَعْفُو عَنِ السَّيِّئَاتِ وَيَعْلَـمُ مَـا تَفْعَلُـونَ} واتە: {وئەو خـودایە زاتـێکە تەوبە لە بەنـدەکانی وەردەگرێـت ولە کـردەوە خراپەکان خۆش دەبێـت وهەرکـردەوەیەک کە ئێـوە ئەنجـامی دەدەن پێـی دەزانێـت} [الشوری:٢٥]. وپێغەمبەری خودا -صلی الله علیه وسلم- دەفەرموێـت: «لَـلَّـهُ أَشَـدُّ فَرَحًا بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ الْمُؤْمِنِ مِنْ رَجُلٍ فِي أَرْضٍ دَوِّيَّةٍ مَهْلِكَةٍ مَعَهُ رَاحِلَتُـهُ عَلَيْهَـا طَعَامُـهُ

وَشَرَابُهُ فَنَامَ فَاسْتَيْقَظَ وَقَدْ ذَهَبَتْ فَطَلَبَهَا حَتَّى أَدْرَكَهُ الْعَطَشُ ثُمَّ قَالَ: أَرْجِعُ إِلَى مَكَانِيَ الَّذِي كُنْتُ فِيهِ فَأَنَامُ حَتَّى أَمُوتَ فَوَضَعَ رَأْسَهُ عَلَى سَاعِدِهِ لِيَمُوتَ فَاسْتَيْقَظَ وَعِنْدَهُ رَاحِلَتُهُ وَعَلَيْهَا زَادُهُ وَطَعَامُهُ وَشَرَابُهُ فَاللهُ أَشَدُّ فَرَحًا بِتَوْبَةِ الْعَبْدِ الْمُؤْمِنِ مِنْ هَذَا بِرَاحِلَتِهِ وَزَادِهِ» واته: «خوای گەورە ئاسوودەترە بە تەوبەی بەندەیەکی ئیماندار زیاتر لە پیاوێک کە ئاژەڵەکەی وخواردن وخواردنەوەی سەرپشتی (ئاژەڵەکەی) لەگەڵدایە لە بیابانێکی چۆڵدا، پیاوەکە خەوت وکاتێک هەستا ئاژەڵەکەی ڕۆیشت (دیار نەما) بۆیە بە دوایدا گەڕا هەتاوەکو تووشی تینوێتی بوو، وپاشان ووتی: بۆ شوێنەکەی خۆم دەگەڕێمەوە ودەخەوم هەتاوەکو دەمرم، وکاتێک سەری لەسەر باسکی دەستی دانا بۆ ئەوەی بمرێت، وخەبەری بوویەوە وبینی ئاژەڵەکەی وخواردن وخواردنەوەکانی سەرپشتی لەلای وەستاوە، خوای گەورە ئاسوودەترە بە تەوبەی بەندەی ئیماندار زیاتر لە ئاسوودەیی ئەم پیاوە بە ئاژەڵەکەی وڕۆزیەکانی سەرپشتی» [صحیح مسلم: ٢٧٤٤].

ومسوڵمان بوون وپەیڕەو کردنی ئاینی ئیسلام هۆکارە بۆ لێخۆشبوون لە هەموو تاوان وگوناهەکانی پێشوو، وهەروەها تەوبە کردن هۆکارە بۆ لێخۆشبوون لە هەموو تاوان وگوناهەکانی پێشوو، خوای گەورە دەفەرموێت: { قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا إِن يَنتَهُوا يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ وَإِن يَعُودُوا فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ الْأَوَّلِينَ} واتە: {(ئەی موحەممەد -صلى الله عليه وسلم-) پێیان بڵێ: بە ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون ئەگەر کۆتایی بهێنن (بە بێباوەڕ بوونیان -بە کافر بوونیان-) بەڕاستی خودا لە هەموو گوناهەکانیان خۆش دەبێت لە هەموو ئەو تاوانانەی لە پێشووتردا کردوویانە بەڵام ئەگەر بگەڕێنەوە (سەر کردەوەی پێشوویان) ئەوە بەڕاستی باو ویاسا بۆ پێشینە خراپەکان چی بوو (بۆ ئەمانیش دووبارە دەبێتەوە)} [الأنفال:٣٨]. خوای گەورە بانگی گاوڕەکان (نەسرانیەکان) دەکات بۆ تەوبە کردن، هەروەکو -سبحانه وتعالى-

دەفەرمویێت: { أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى اللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ } واتە: {دەی ئایا بۆ تۆبە ناکەن و ناگەڕێنەوە بۆ لای خوا ؟ وداوای لێبوردنی لێ ناکەن؟ لەکاتێکدا خـوا لێبـوردەی میهرەبـانە} [المائـدة:٧٤]. خـوای گەورە بانگهێشـتی هەمـوو گوناهکـار وتاوانکارەکان دەکات بۆ تەوبە کردن، خوای گەورە دەفەرمویێت: {قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ } واتە: {(ئەی موحەممەد -صلى الله علـيه وسـلم-) پێیـان بڵـێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کە خۆتان زۆر گوناهبار کردووە نائومێد مەبـن لە میهرەبـانی و بەزەیی خوا چونکە بێگومان خوا لە هەموو گوناهەکان خۆشـدەبێت بەڕاسـتی هەر ئەوە لێبوردەی میهرەبانە} [الزمر:٥٣]. کاتێک عەمروی کـوڕی عـاص -ڕەزای خـوای لێبێت- سوور وپێداگیر بوو لەسەر ئەوەی کە مسوڵمان بێت؛ لەوە ترسا کە خودا لەو تاوانانەی خۆش نەبێت کە لە پێش مسـوڵمان بـوون کردوویەتـی، عەمـرو ئەم باسـە دەگێڕێتەوە ودەڵێت: «لَمَّا أَلْقَى اللهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي قَلْبِي الْإِسْلَامَ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِيُبَايِعَنِي فَبَسَطَ يَدَهُ إِلَيَّ فَقُلْتُ: لَا أُبَايِعُكَ يَا رَسُولَ اللهِ حَتَّى تَغْفِرَ لِي مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِي قَالَ: فَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «يَا عَمْرُو أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ الْهِجْرَةَ تَجُبُّ مَا قَبْلَهَا مِنَ الذُّنُوبِ يَا عَمْرُو أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ الْإِسْـلَامَ يَجُـبُّ مَـا كَـانَ قَبْلَهُ مِنَ الذُّنُوبِ» واتە: «کاتێک خوای گەورە ئیسـلامی خسـتە دڵـمەوە، (عەمـرو) دەڵێت: هاتم بۆ لای پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم بۆ ئەوەی بەیعەتی پێبدەم بـۆیە دەستی درێژ کرد، منیش ووتم: بەیعەتت پێنادەم هەتاوەکو (خوای گەورە) لە هەمـوو گوناهەکانی پێشووم بێت، ئەویش -صلى الله عليه وسلم- فەرمـووی: «ئەی عەمـرو، ئایا نازانی کۆچک کردن -هیجرەت- هەرچی لە پێش خۆیدا هەبـووە (لە گوناهەکـان) هەڵیدەوەشـێنێتەوە وئیسـلام هەرچـی لەپـێش خۆیـدا هەبـووە (لە گوناهەکـان)

هەڵیدەوەشێنێتەوە -واتا: هیجرەت ومسوڵمان بوون هۆکارن بۆ لێخۆشبوون لە گوناهەکان-» [رواه مسلم:١٢١، رواه أحمد: ١٧٨٢٧].

## ٤٣. لە ئاینی ئیسلامدا پەیوەندی نێوان مرۆڤ وخودا پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیە، بۆیە مرۆڤ پێویستی بە هیچ ناوەندێک -واستەیەک- نییە بۆ پاڕانەوە وداواکردن وپەرستنی خودا، ئاینی ئیسلام قەدەغەی دەکات کە مرۆڤ بکرێتە خودا یان هاوبەش وشەریکی خودا لە پەروەردگارێتی وپەرستنیدا (ئولوهیەتدا : خودایەتیدا).

لە ئاینی ئیسلامدا هیچ پێویست ناکات تاوانەکان لە پێش خەڵکیدا باس بکەیت ودانی پێدا بنێیت، چونکە لە ئیسلامدا پەیوەندی نێوان مرۆڤ وخودا پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیە وپێویستی بە ناوەندی (واستەی) هیچ بوونەوەرێک نییە، هەروەکو لە بڕگەی (٣٦)دا باسکرا کە خودا بانگی هەموو خەڵکی کردووە بۆ تەوبە کردن وگەڕانەوە بۆ لای ئەو زاتە مەزنە وهەروەها خودا نەهی کردووە لە خەڵکی کە پێغەمبەران وفریشتەکان بکەن بە نێوەند (واستە) لە نێوان خۆیان وخودا بۆ ئەوەی بەهۆیانەوە لە خودا بپاڕێنەوە وبیپەرستن، بەڵکو دەبێت مرۆڤ ڕاستەوخۆ داوا لە خودا بکات ولێی بپاڕێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا الْمَلَائِكَةَ وَالنَّبِيِّينَ أَرْبَابًا أَيَأْمُرُكُم بِالْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ} واتە: { وخودا فەرمانتان پێنادات کە فریشتەکان وپێغەمبەران بکەن بە پەرستراوی خۆتان چۆن (خودا) فەرمانتان پێدەدات بێباوەڕ بن (کافر بن) دوای ئەوەی کە ئێوە بڕوادار بوون؟! } [آل عمران:٨٠]. ئاینی ئیسلام هەروەکو دەیبینین قەدەغەی دەکات کە مرۆڤ بکرێتە خودا یان هاوبەش وشەریکی خودا لە پەروەردگارێتی وپەرستنیدا

(ئولوهیەتـدا : خودایەتیـدا)، خـوای گەورە سـەبارەت بە نەسـڕانیەکان -گاوڕەکـان- دەفەرموێت: {اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِـيحَ ابْـنَ مَـرْيَمَ وَمَـا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا إِلَهًـا وَاحِـدًا لا إِلَـهَ إِلاَّ هُـوَ سُـبْحَانَهُ عَـمَّا يُشْرِـكُونَ} واتـە: {زانـا و ڕاهیبەکانیـان (دینـدارەکانیان) کـردووە بە پەروەردگـار لە جیـاتی خـوا هەروەهـا مەسیحی کوڕی مەریەمیش (یان کردوە بە خوا) لە کاتێکـدا فەرمانیـان پـێ نەدراوە بێجگە لەوەی کە یەک خوا بپەرستن کە هیچ پەرستراوێک ڕاست نیە بێجگە لە ئەو زاتە، پاک و بێگەردی بۆ ئەو (خودا) یەی لەوەی دەیکەنە هاوبەشی} [التوبة:٣١].

وخوای گەورە ئینکار ونەهی کرد لەسەر کافرەکان ئەویـش بەهـۆی ئەوەی لە نێوان خۆیان وخودا ناوەندێکیان -واستەیەکیان- دادەنا بۆ پـاڕانەوە، خـوای گەورە دەفەرموێت: {أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَـاءَ مَـا نَعْبُـدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيـهِ يَخْتَلِفُـونَ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْـدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ} واتە: { بێداربە ئاینی (گەردنکەچی) پاك و خاوێن هەر بۆ خوایە وە کەسانێك جگە لە (خوا) چەند پەرستراوێکیان بۆ خۆیـان دانـاوە (دەڵـێن) تەنهـا لەبەر ئەوە دەیان پەرستین نزیکمان بکەنەوە لە خوا بێگومـان خـوا بڕیـار دەدات لە نێوانیاندا لەو شتانەدا کە ئەوان تیایدا جیاواز بوون بەڕاستی خوا ڕێنمـونی کەسـێك ناکات کە درۆزنی زۆر بێباوەڕە} [الزمـر:٣]. خـوای گەورە ڕوونـی دەکـاتەوە کە بـت پەرستەکان -ئەهلی جاهیلیەت- لە نێوان خۆیان وخودا ناوەنـدێکیان -واسـتەکەیان- دادەنا ودەیانووت: ئەمانە لە خـودا نـزیکمان دەکەنەوە. وئەگەر خـوای گەورە نەهـی کردبێت لە خەڵکی بەوەی کە پێغەمبەران وفریشـتەکان بـکەن بە نێوەنـد لە نێـوان خـودا وبەندەکانـدا؛ ئەوا جـگە لە ئەوان نەهـی لێکـردنە زیـاتر دەیـانگرێتەوە، وپێغەمـبەران -علـیهم السـلام- بەپەلە بـوون لە ئەنجامـدانی کـردەوە چاکەکـان ونزیکبوونەوە لە خودا، خوای گەورە سەبارەت بە حاڵی پێغەمبەران -علیهم السـلام-

دەفەرموێت: {إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ } واتە: {ئەوانەی (باسكران لە پێغەمبەران) پێشبڕكێیان دەكرد لە ئەنجامدانی هەموو خێر وچاكەیەكدا وهاواریان لە ئێمە دەكرد بە ئومێدی (بەهەشت) ولە ترسی (دۆزەخ) وئەوان بۆ ئێمە ملكەچ بوون (ودەترسن لێمان)} [الأنبياء:٩٠]. وخوای گەورە دەفەرموێت: {أُولَٰئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا} واتە: {ئەوانەی كە ئەو (نەفامانە) هاواریان لێ دەكەن ئەوانە بەدوای هۆكارێكدا دەگەڕێن كە نزیكیان بكاتەوە لە پەروەدگاریان كامیان نزیكترە (لە خواوە و پلەو پایەی بەرزترە) وە بە هیوا و ئومێد و ڕەحمی ئەون و لە سزایشی دەترسن بەڕاستی سزای پەروەردگارت هەمیشە مەترسی لێكراوە و خۆ لێ پارێزراوە} [الإسراء: ٥٧]. واتا ئەوانەی كە داوایان لێدەكەن ولێیان دەپاڕێنەوە جگە لە خوای گەورە -لە پیاوچاكان وپێغەمبەران- ئەوان هیوا ورەجایان ئەوەیە كە خودا ڕەحمیان پێبكات ولە سزای خودا دەترسن؛ ئیتر چۆن داوا لە ئەوان دەكەن ولێیان دەپاڕێنەوە !! بەڵكو پێویستە مرۆڤ تەنها داوا لە خودا بكات وتەنها لە ئەو زاتە مەزنە بپاڕێتەوە.

٤٤. له كۆتایی ئەم پەیامەدا ئەوە بە بیری خەڵکی دەهێنینەوە کە خەڵکی سەرەڕای جیاوازی سەردەم وگەل وشوێنی نیشتەجێبوونیان بەڵکو هەموو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی جیاوازە لە بۆچوون ومەبەستەکانی وجیاوازە لە ژینگە وکردەوەکانی بۆیە پێویستە کە هیدایەتێک هەبێت ئاراستەی بکات ورێکخستەیەک هەبێت کۆیان بکاتەوە ودەسەڵاتدارێک هەبێت بیانپارێزێت، بۆیە پێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام- ئەمەیان جێبەجێ دەکرد بە وەحی خودا -سبحانه وتعالی- وخەڵکیان هیدایەت دەدات بۆ ڕێگای خێر وڕێنموێنی وخەڵکییان کۆ دەکردەوە لەسەر جێبەجێکردنی شەریعەتی خودا ولە نێوانیاندا بە هەق حوکم وفەرمانڕەواییان دەکرد ئەمەش هۆکاری ئەوە بوو حاڵ وگوزەرانیان باش بێت بە پێی وەڵامدانەوەیان بۆ بانگەوازی پێغەمبەران ونزیکیان لە سەردەمی ناردنی پەیامەکانی خودا، وخوای گەورە پەیامەکانی کۆتایی پێهێنا بە کۆتا پەیامی پێغەمبەر موحەمەد -صلى الله عليه وسلم- ومانەوەی بۆ نووسی وکردیە بە هۆکاری هیدایەتدان وڕەحمەت ونور وڕۆشنایی وڕێنموێنی کردن بۆ سەر ئەو ڕێبازەی کە مرۆڤ نزیک دەکاتەوە لە خودا.

کاتێک گومڕایی زۆر بوو ونەزانین -جەهالەت- بڵاو بووەوە وبتەکان پەرستران؛ خوای گەورە پێغەمبەر موحەمەدی نارد -صلى الله عليه وسلم- بە هیدایەت وئاینی هەق وڕاستی بۆ ئەوەی خەڵکی دەربکات لە تاریکایی کوفر ونەزانین -جاهیلیەت- وبت پەرستی بۆ نور وڕۆشنایی ئیمان وهیدایەت.

٤٥. بـۆیه ئەی مـرۆڤ بانگـت دەکەم بـۆ ئەوەی خـۆی یەکلایـی بکەیتەوە لە پێناو خوای گەورە بە ڕاستگۆییەوە وخۆت بە دوور بگریت لە لاسـایی کـردنەوە وخـوو ونەریـت، وبزانیـت لە پـاش مردنـت بـۆ لای پەروەردگـارت دەگەڕێیـتەوە، وسـەیری نەفـس ولاشـەی خـۆت بکەیـت وسەیری گەردوون بکەیت، ئەگەر مسوڵمان بیـت ژیانـت خـۆش دەبێـت پێش خۆشی نەبڕاوەی ڕۆژی دوایی، وئەگەر ویسـتت ببیـت بە مسـوڵمان ئەوا تەنها لە دڵەوە وبە زمانیش ئەم شاهێدیە بدەیت: (أشهد أن لا إلـه إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله) واتە: (شـاهێدی دەدەم ودانیپێـدا دەنـێم کە هیچ پەرستراوێک هەق وڕاست نییە کە شایەنی پەرستن بێت جـگە لە الله ، وشاهێدی دەدەم ودانیپێدا دەنێم کە موحەمەد نێـردراو وپێغەمـبەری خودایە)، ودەبێت بێباوەڕ بیت بە پەرستنی هەرشتێک یان کەسێک جگە لە خوای گەورە، وباوەڕت بەوە هەبێت کە خـوای گەورە لە پـاش مردنمـان هەمووی زیندوو دەکاتەوە لە نێو گۆڕەکانەوە ولێپرسینەوە وپاداشت وسـزا هەق وڕاستیە، ئەگەر ئەم شاهێدیە بدەیت ئەوا تۆ مسـوڵمانیت، ولە پـاش ئەمە دەبێت خودا بپەرستیت بەو شێوەیەی لە شەریعەتی ئیسلامدا هاتووە لە گـرنگترین پەرسـتنەکانیش کە پـایەی ئیسـلامن: نـوێژ کـردن، ڕۆژوو گرتن، زەکاتدان، وحەجکردن بۆ ماڵی خودا ئەگەر لە تواناتدا هەبوو.

بۆیە ئەی مرۆڤ بانگت دەکەم بۆ ئەوەی هەستیت بە ڕاستگۆییە وخۆت بە دوور بگریـت لە لاسـایی کـردنەوە وخـوو ونەریتـی هەڵە، هەروەکـو خـوای گەورە دەفەرموێت: {قُلْ إِنَّمَا أَعِظُكُم بِوَاحِدَةٍ أَن تَقُومُوا لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَادَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا مَـا

بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ} واته: {بڵێ من تەنها بە یەک شت ئامۆژگاریتان دەکەم کە دوو دوو، یەك یەك، لەبەر خوا هەستن (وگوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن) پاشان بیر بکەنەوە هاوڕێکەتان (پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم-) شێت نییە ئەو (پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم-) تەنها ترسێنەرە بۆ ئێوە لە پێش هاتنی سزای سەختی (قیامەت)} [سبأ:٤٦]. وبزانیت کە لە پاش مردنت دەگەڕێیتەوە بۆ لای پەروەردگارت، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ (٣٩) وە بێگومان ئادەمی جگە لە کۆششی خۆی خاوەنی هیچی تر نییە -لە دوارۆژدا- (٣٩) وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَىٰ (٤٠) و بێگومان هەوڵ کۆششەکەی لە داهاتوو (لە قیامەت)دا دەبینرێتەوە (٤٠) ثُمَّ يُجْزَاهُ الْجَزَاءَ الْأَوْفَىٰ (٤١) پاشان پاداشت دەدرێتەوە بەتێر وتەواوی (٤١) وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ الْمُنتَهَىٰ (٤٢) وە بەڕاستی هەموو کارێک سەرەنجامەکەی هەر بۆ لای پەروەردگارت دەگەڕێتەوە (٤٢)} [النجم:٣٩-٤٢]. وسەیری لاشەی خۆت وسەیری گەردوون وئاسمان بکە، خوای گەورە دەفەرموێت: { أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ وَأَنْ عَسَىٰ أَن يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ ۖ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ} واته: {ئایا ئەوانە ناڕوانن؟ لەو موڵکە گەورە وفراوانەی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە ولەو شتانەی خوای گەورە دروستی کردوون ولەوانەیە نزیک بوو بێتەوە کۆتایی (ژیان) یان ئینجا بە چی قسەیەک لە پاش قورئان بڕوا دەهێنن} [الأعراف:١٨٥].

ببە بە مسوڵمان بۆ ئەوەی لە دونیا ودوارۆژت ئاسوودە ودڵخۆش بێت، وئەگەر دەتەوێت ببیتە مسوڵمان وپەیڕەوی ئاینی ئیسلام بکەیت؛ ئەوا تەنها پێویستە کە شاهێدی بدەیت بە (لا إله إلا الله ومحمد رسول الله) واته: (هیچ پەرستراوێک هەق وڕاست نییە جگە لە الله، وموحەمەد -صلى الله عليه وسلم- پێغەمبەر ونێردراوی خودایە) وکاتێک پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- موعازی نارد بۆ

یەمەن بۆ ئەوەی بانگەوازی بکات بۆ ئاینی ئیسلام پێی فەرموو: «إِنَّكَ تَأْتِي قَوْمًا أَهْلَ كِتَابٍ فَادْعُهُم الَى شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَـهَ إِلَّا اللهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ لِذَلِكَ فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ فَإِنْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً فِي أَمْوَالِهِمْ تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ وَتُرَدُّ فِي فُقَرَائِهِمْ فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوكَ لِذَلِكَ فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ فَإِنَّهَا لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ حِجَابٌ» واتە: «تۆ دەچیت بۆ لای کەسانێک لە ئەهلی کتێب (جولەکە ونەسڕانیەکان) با یەکەم شت کە بانگەوازی بۆ دەکەیت بریتی بێت لە شاهێدی دان بە (لا إله إلا الله)* وشاهێدی دان بەوەی من پێغەمبەری خودام، ئەگەر لەوەدا گوێڕایەڵ بوون پێیان ڕابگەیەنە کە خودا پێنج نوێژی لەسەریان فەرزکردووە لە هەموو ڕۆژ وشەوێکدا، ئەگەر لەوەدا گوێڕایەڵ بوون پێیان ڕابگەیەنە کە خوای گەورە خێرکردن (زەکات) ی لە سەریان فەرز کردووە لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێت ودەدرێت بە هەژارەکان، ئەگەر لەوەدا گوێڕایەڵ بوون ئاگادار بە لە باشترین وچاکترینی پارە وماڵەکانیان نەبەیت، وئاگاداری نزای ستەملێکراو بە چونکە لە نێوان ئەو وخوادا هیچ پەردەیەک نییە». *(واتە: هیچ پەرستراوێک هەق وڕاست نییە کە شایەنی پەرستن بێت جگە لە الله) [صحيح مسلم: ١٩].

ودوور بیت وبەرائەتی خۆت ڕابگەیەنیت وبێباوەڕ بیت: بە بت پەرستن وبە پەرستنی ئەوانەی لەگەڵ خودا دەپەرسترێن، وئەمیش حەنیفیەتە* کە ئاینی ئیبراهیمە -عليه السلام-، (حەنیفیەت: واتا پەرستنی خودا (الله) بە تەنها بە دڵسۆزییەوە بە بێ بڕیاردانی هیچ شەریک وهاوبەشێک لە پەرستنیدا، وخۆ دوورکردنەوە وبەریئبوون وبێباوەڕ بوون: بە پەرستنی بتەکان وبە پەرستنی پەرستراوە ناهەقەکانی تر لەگەڵ خوای گەورەدا)، خوای گەورە دەفەرموێت: { قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا

تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ } واته: {بەڕاستی بۆ ئێوە هەیە سەرمەشقێکی جوان وچاك لە ئیبراهیم وئەوانەی لەگەڵیدا بوون کە بە گەلەکەی خۆیانیان ووت بەڕاستی ئێمە بێزار وبەرین لە ئێوە و لەو شتانەش کە دەیان پەرستن لەجیاتی خوا، ئێمە باوەڕمان نییە بە (ئاینی) ئێوە و پەیدابوو لە نێوان ئێمە وئێوەدا دوژمنایەتی وکینە بۆ هەمیشەیی تا کاتێك کە باوەڕ بە خوای تاك وتەنیا دەهێنن}، وهەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:{ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ } [الممتحنة: ٤].

وباوەڕ وئیمانت بەوە هەبێت کە خودا هەموو ئەوانەی لە نێو گۆڕەکاندان (مردووەکان) زیندوو دەکاتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: {ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّهُ يُحْيِي الْمَوْتَىٰ وَأَنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٦) ئەوەی (باسکرا) لەبەر ئەوەیە دڵنیابن کە خوا هەق و ڕاستە وە بێگومان مردووەکان زیندوو دەکاتەوە و بێگومان ئەو (خوایە) توانای بە سەر هەموو شتێکدا هەیە (٦) وَأَنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِي الْقُبُورِ (٧) وەبەڕاستی قیامەت دێت (وبەرپا دەبێت) گومانی تێدا نییە ودڵنیاش بن خوا زیندووی دەکاتەوە هەموو ئەو کەسانەی لەناو گۆڕەکاندا - مردوون- (٧)} [الحج: ٦-٧].

ولێپرسینەوە وپاداشتدانەوە هەقە وڕوودەدات، خوای گەورە دەفەرموێت: {وَخَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ }واتە: {و خوا ئاسمانەکان وزەوی بەهەق وڕاستی دروستکردووە بۆ ئەوەی هەموو کەسێك پاداشت بدرێتەوە بە گوێرەی ئەو کار وکردەوانەی کە کردوویەتی وئەوان هیچ ستەمیان لێناکرێت} [الجاثیة: ٢٢]. ئەگەر ئەم شاهێدیەت دا ئەوا تۆ

مسوڵمانیت وله پاش ئەمە پێویستە خـودا بپەرسـتیت بەو شـێوەیەی لە شـەریعەتدا هاتووە لە نوێژکردن ورۆژوو گرتن وزەکاتدان وحەجکردن ئەگەر لە تواناتـدا هەبـوو، وجگە لە ئەم پەرستنانە.

مێژووی چاپ: ١٩-١١-١٤٤١

نوسینی: مامۆستا دکتۆر/ محمد عبدالله السحیم
مامۆستای عەقیدە (بیروباوەڕ) لە بەشی خوێندنەوە ئیسلامیەکان (لە پێشوودا)
کۆلێژی پەروەردە، زانکۆی (شا سعود)